لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

---

زنجیرەی ژیاندنەوەی کەلەپووری ئەدەبی کورد ـ ژمارە (٣)

دانـــانی

مامۆستا مەلا محەممەدی حاجی حەسەن

# ابن الحاج

لێکۆڵینەوە و پێشکەش کردنی

محەمەد عەلی قەرەداغی

پیاچوونەوەی

شوکور مستەفا

ئەندامی یاریدەری کۆڕی زانیاری کورد

---

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغدا

١٩٧٥

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

زنجیرەی ژیاندنەوەی کەلەپوری ئەدەبی کورد ـ ژمارە (٣)

دانـــانی

مامۆستا مەلا محەممەدی حاجی حەسەن

ابن الحاج

لێکۆڵینەوە و پێشکەش کردنی

محەمەد عەلی قەرەداغی

پیاچوونەوەی

شوکور مستەفا

ئەندامی یاریدەدەری کۆڕی زانیاری کورد

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغدا

١٩٧٥

من مطبوعات المجمع العلمي الكردي

# مهـــدي نامـــة

## (( الرسالة المهدية ))

تأليف

الملا محمد الحاج حسن المعروف

**بابن الحاج**

حققه وقدم له

**محمد علي القرەداغي**

وراجعه

**شكر مصطفى**

العضو الموآزر للمجمع العلمي الكردي

مطبعة المجمع العلمي الكردي

بغداد ــ ١٩٧٥

ڕێزی خوێندنی ئایینی لە کوردستاندا یەکجار جێگای بایەخ بووە و سەر تاسەری شار و دێهاتەکانی مەڵبەند و شوێنی خوێندنی باشیان تیابووە و، فەقێ و قوتابێ ڕۆی لە هەر کوێ کردبێ بەوپەڕی ئازادییەوە بۆ خۆی گەڕاوە و هەر جێگاو مەدرەسەیەکی بە دڵبوبێ لەوێ خوێندویە ، هەر کاتێك بە جێگایەکی باشتر ، یان مامۆستایەکی بە کەڵکتری بیستبێ یەکسەر لێفەکەی و کتێبەکانی بەسەری گۆپاڵەکەیا کردووە و بە نەڕی شانیا داوە و یاڵلا بۆ ئەو جێگەیە و سەری لە مەرز و سنوری هیچ وڵاتێك نەکردۆتەوە ؛ چونکە فەقێ ، وەك ئازادێ هەمو مزگەوت و مەدرەسەیەك ، ئازادێ تەواوی لە گەڕانی وڵاتان و شاراندا هەبووە ، بۆیە کە ژیانی زۆربەی مامۆستایانی کورد لەگەڵ گەڕانی زۆر بە شوێن خوێندندا دەستە لە ملانن و ، بە ئاسانی ناتوانرێ هەمو جێگاخوێندنەکانی مەلایەك دەس نیشان بکرێ ٭

جا هەر بەم پێ و دانگە کردنەوەی مەدرەسە و جێگای خوێندن لە هەمو مزگەوت و گوندێکدا ئازاد بووە و هیچ کات لە کردنەوەی فێرگە و مەڵبەندی زانیارێدا دەست ڕێگەی کەس نەهێنراوە ، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەمو میر و پاشایەکی کوردستان هەمیشە شانازێ بەوەوە کردووە کە

فێرگەی گەورە و باشی بووە و مەلای چاك و زۆر خوێندەواری تیابووە و ، کتێبی زۆری ، بە نوسینەوە و کڕین ، بۆ بەدەست هێناوە و ، باخ و زەوی و زاری باشی بۆ وەقف کردووە و ، خزمەتی چاکی مەلا و فەقێکانی کردووە • ئەمە بوە بەهۆی مونافەسەیەکی زۆری، لە هەمان کاتدا پیرۆزی ، دانیشتوانی ناوچەی کوردستان لە کردنەوەی مەدرەسە و پێگەیاندنی خوێندەواری باشدا • ئەمە کارێکی وای کرد کە زۆربەی شار و دێهاتەکانی کوردستان فێرگە و جێگای فێربونی زانیاری تیا بلاو ببێتەوە ، تەنانەت گوندێك هەر هیچی تیا نەبوبێ مەلایەکی بووە کە قوتابخانەی بووە و منداڵی فێری خوێندنی قورئان و کتێبی فارسی و کتێبە سەرەتاییەکان کردووە و لە پاش ئەوە بەرەو فێرگە بەرزەکان ڕێگەی خوێندنیان گرتوتە بەر •

زۆربەی ئەو فێرگانەی کوردستان ناو و شوێنەواریان نەماوە ، بەڵام گەلێ جێگای وا هەیە کە توانیویەتی بەربەرەکانی لەگەڵ ئاڵۆزی و ناهەمواری باری ڕۆژگاردا بکا و ، شوێنەواری خۆی بە ڕونی و ورشەداری بهێڵێتەوە و ، گەلێ زانا و پیاوی بەرزیش بە هۆی ئەو جێگایانەوە ناویان ماوەتەوە و لە بیر نەکراون ، لەو مەڵبەندە زانیارییانەی کوردستان گەلێ جێگای واش هەبووە کە پشتاو پشت تیرە و بنەماڵەیەك ئەرکی فێرکردنی فەقێ و پێگەیاندنی مەلایان لە ئەستۆی خۆیان گرتووە و هەمیشە نەوەکانیان بە چالاکی و لێهاتوییەوە جێگاکانیان پڕکردۆتەوە •

وەکو وتمان، هەندێك لەو فێرگە و مەڵبەندە زانیارییانە لەگەڵ دژواری و نالەباری ڕۆژگاردا هەڵیان کرد و لە ئەنجامدا بە سەر کۆسپ و تەگەرەکاندا زاڵ بون و ناویان لەوە زیاتر دەرکرد کە چەرخی گەردون بتوانێ پێ‌شێلیان بکا و شوێنەواریان کوێر بکاتەوە • ئەوەتا ئێستاش ناو و نیشانی گەلێك لەو مەڵبەندانە لەسەر لاپەڕەکانی مێژو بە شانازییەوە تۆمار ئەکرێ و هەندێکیشیان ناویان لە پەراوێز و کۆتایی کتێبە دەس‌نوسەکاندا ماوەتەوە و هەندێکی دیکەشیان لە بیری زانا و پیاوە بەتەمەنەکانی ئەم سەردەمەدا جێی

خۆیان کردۆتەوە ؛ بەلاّم ئــەو مەڵبەندانەی کە ئێستە ئەناسـرێن وە نەبێ وێنەی بەشی زۆری ئەو مەڵبەندانەی پێشوبن و لەبیرکراوەکان لەمان کەمتر بن ، بەڵکو ناسراوەکان لە عاسـتی نەناسـراوەکاندا وەکـو دلۆپێك لە دەریایە !

کۆنترین مەڵبەندی زانیاریێ من توانیبێتم هەواڵی لێ بەدەست بهێنم فێرگەی ( چـۆڕ )ە کە مەلا ئەبو بەکـری مصنف لە دەوروبەری ١٠٠٤ی کۆچیدا لــە ( وشکێن )ەوە هاتۆتە ئەوێ و لەوێـدا کتێبی ( وضوح )ی شەرحی ( محرر )ی داناوە ؛ جا ئەبێ پتر لە (٩٠٠) ساڵ پێش ئەو سەردەمە، کە ئایینی ئیسلام بە کوردسـتاندا بلاّوبۆتەوە ، چەند مەڵبـەند و کۆڕی زانیاریێ پێك‌هاتبێ و ، چەند زانای گەورەیان تێدا هەڵکەوتبێ کە ئێستە ئێمە هیچ هەواڵێکی ئەوتۆیان لێ نازانین ؟ ؟ پاش ئەوە ئەتوانین وەك نمونە ناوی مەڵبەندی (ماوەران) (١) و (خەتێ)(٢) و (کۆیە)(٣) و (سۆران)(٤) و

---

(١) ماوەران : دێیەکە لە نزیکی شەقلاوە ، جێگەی بنەماڵەی ( حەیدەریێ ) بووە .

ئەم چەند شـیعرەی مامۆسـتا ( بێتوشیێ ) جوانتـرین ئاوێـنەی دەرخستنی ڕێز و جێگای ئەو بنەماڵەیە :

« کل حر في فضله عبد رق — لــموال تدیـروا ( ماورانا )
وأقروا لهم سوی من هواه — ترك القلب منه اعمی ورانا
کم شفوا بالعلوم منا صدورا — کان فیها من جهلنا ماورانا ؟
سئلوا : هل وراکم من مرام — لمرید ؟ فقیل : لا، ما ورانا»

( بڕوانە ) : البیتوشی ، مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ ، لاپەڕە (٢٣١)) .

(٢) لە زنجیرە و ناوی زانـایانی کوردا مامۆستای خــەتێ و مەدرەسـەکەی جوانترین و بەرزترین ناوی هەیە .

(٣) لە ( کۆیە )دا چەند فێرگە هەبووە ، یەکێك لەوانە کە لە پەراوێزی کتێبە دەس‌نوسـەکاندا نـاوی مابێ مەدرەسەی ( دایەخەج )ە . هــەر وەها بنەماڵەی ( جەلیێ ) لە کۆیەدا ماوەیەکی زۆر پشتا و پشت سەرچاوەی زانیاریێ بوون و مەلا و خوێندەواری چاکیان پێ‌گەیاندووە .

(٤) سۆران لە کتێبە دەس‌نوسەکاندا ناوی زۆر ئەهێنرێ و بە ( صۆران )

=

گەلێ فێرگەی گەورەی هەولێر و (موصل) و (ڕەواندز) و (شەقلاوە)(٥) و (قەلاچوالان)ی پایتەختی بابانیەکانو چەندین جێگەی دەور و بەری (سلێمانێ) وەك : (قەرەداغ)(٦) و (تەکیە) (٧) و (خەرپانێ)(٨) و

---

=
ئەینوسن . ئەشگونجێ سۆران مەبەست ناوچەیەکی تایبەتی بوبێ لە سەردەمێکدا . یان مەبەست ئیمارەتی سۆران بێ کە لە نێوان ئیمارەتی بابان و بەهدینان‌دا بووە .

(٥) لە دەورو بەری شەقلاوە و ڕەواندزدا گەلێ زانای پایە بەرز و بنەماڵەی دێرین بووە ، بە ناوبانگترین بنەماڵەی ئەو ناوچانە بنەماڵەی (حەیدەری)یە کە پتر لە (٣٠٠) ساڵ لە دەشتی (حەریر)دا پشتاو پشت سەرۆکی گەورەترین مەڵبەندی زانیاری بوون و ، زنجیرەیەکی ئیجازەی مەلایەتی کوردستان بە زانایانی ئەو بنەماڵەیە پڕبۆتەوە . جگە لەو بنەماڵەش گەلێ ناوی ورشەداری تر هەن کە هەر لە بیرنەکراون وەك ( ابن آدم ) و مامۆستا شێخ طاهای بالیسانێ و مەلا محەممەدی مەلا نەبی بێتواتە و مەلا عوثمانی شەوەکێ و چەندینی تر .

(٦) قەرەداغ : گەلێك زانای گەورەی تێدا پەیدابووە و ، دەرسیان وتوەتەوە و مەلای چاکیان پێ‌گەیاندووە ، لەو مەلایانە : شێخ محەمەد و شێخ عەبدوڕەحمانی قەرەداخێ و، شێخ عەبدوللەتیفی قەرەداخێ و شێخ مەعروفی قەرەداخێ و شێخ عومەری کوڕێ و ( ابن الخیاط ) و شێخ نەجیبی قەرەداخێ و شێخ مستەفای کوڕی ...

(٧) تەکیە ماوەیەکی زۆر مەڵبەندێکی گەورەی‌زانیاری بووە و ، پشتاو پشت مەلای تەکیەیێ دەرسیان تیا وتوەتەوە و لە هەمو لایەکەوە فەقێ بەدەنگ و شۆرەتی ئەو مەلا چاکانەوە چون و لایان خوێندون . زانا و ئەدیبی وەکو ( نالی ) لە تەکیەدا ماوەیەك خوێندویە ، زیاتر لەوەش ، وەك لە پیاوێکی ڕێش‌سپێ تەکیەم بیستووە ، سەرەتای ئەوینی نالی و پژان و تەقینەوەی سەرچاوەی شیعری‌لە تەکیەوە دەستی پێ کردووە و دڵدارەکەی ( ئایشێ )ی ناو بووە و ، کچێکی خەڵکی تەکیە بووە ، بەڵام ئەمە لە گەڵ ( حەبیبەی مالییاوا ... )دا چون ئەگونجێ ؟ ئەوە نازانم و بەڵکو لەمەولا زیاتر لەم باسە ڕون ببێتەوە . لەو زانایانەی کە لە تەکیەدا دەرسیان وتوەتەوە : سەیدشەریفوددین و ، سەید نورەددین و ، سەید سەلاحەددین و ، سەید عەوەز و ، شێخ جامێ و شێخ یوسفی کوڕی و،
=

(خورماڵ)(٩) و (بیاره)(١٠) و (تەڕەمـار)(١١) و (هەزارمێـرد)(١٢) و

=

ماموستا شـێخ باباعەلی و شـێخ نـوری کوڕی و شـێخ عەبدوڵلای مەلا . . . تاد

(٨) خەرپانی : کە ئێسـتە جێگە و ناوێکی تایبـەتی بۆ خۆی هـەیە و ، بە کوڕێکی زانیاریی سەربەخۆ ناسراوە ، لقێکە لە مەڵبەندی زانیاریی تەکیە؛ چونکە سەرەتای بنەماڵەی خەرپانی لە شێخمحەمەدە کۆستەوە دەست پێ‌ئەکات کە لە ساڵی (١١١٠)ی ك وە لـە تەکیەوە چووەتە خەرپانێ و لەوێ جێگیر بووەو مزگەوتی شێخ محەمەدە کۆستەی لەخەرپانی دروست کردووە . ئەوەی شایانی باس بێ : کاتێـك وتارەکەی ( الشیخ عبدالله الخرپانی من خلال مخطوطات مکتبته )م ئەنوسی کە لە بەشی دوهەمی ژمارە دوی گۆڤاری کوڕی زانیاریی کوردا بلاوکرایەوە ، بۆم ڕون نەبووەوە شێخ محەمەدە کۆستە لە سەرەتاوە لە خەرپانی دانیشـتووە یان لـە ( احمدئاوا ) بەلام لەم بەینەدا بۆم دەرکەوت کە لە خەرپانی دانیشتووە و لە گەڵ مەلا جەلالی گەورەی خورماڵدا ئەوەندە دۆسـتی گیانی بەگیانی یەك بون وەصیەتیان بۆ یەك‌کردووە کە لە پاش مردنیش نزیکی یەکتربن و بەیەکەوە ئەسپەردەی خاك بکرێن ، بۆیە ئێستە گۆڕی شـێخ محەمەدە کۆستە لە تەنیشت گۆڕی مەلا جەلالەوەیە لە ئەحمەد ئاوا .

پیاوانی وەکو موفتی زەهاوی و نـالی و مەولانا خـالید لە لای شێخ عەبدوڵلای خەرپـانیو لـە فێرگـەی خەرپانیـدا زۆری خوێنـدن و خوێندەواریان فێربون .

(٩) خورماڵ : مەلا جەلالی گەورە و مەلا جەلالی بچوك و چەندین مەلای تر دەرسیان تیا وتووەتەوە .

(١٠) بیارە : خانەقای طەریقەی نەقشبەندی بووە و شێخانی ئەم طەریقەیە ، جگە لەوە کە خۆیان مـەلا بون و تا ئەندازەیەکی باش خوێندەواریان بووە ، هەمیشە مەلای چاکیان بووە و فێرگەیەکی باش لەگەڵ خانەقادا بووە و ، ڕێزی فەقێ و مەلایان زۆر لە لابووە و ، بەرانبەری ئەو ڕێز و خزمەتە مەلاو ئەدیبانیش بەگەلێ جۆر هەستی خۆیان دەربڕیوە و خۆیان نواندووە، بۆ نمونە مەولەوی کتێبی ( الفضیلة ) ی بۆ شێخی (بهاءالدین) داناوە و لە پێشـەکیەکەیدا زۆر بە جوانی پێشکەشی کردووە . سەرەڕای ئەوەش شێخانی طەریقـەی نەقشبەندی زۆر ئەدەب دۆست بون و

=

(پێنجوێن)(١٣) و دەیان جێگەی تر ببینین • خۆ کاتێك ئاورێك بەلای ئێران و تورکیادا ئەدەینەوە هەمان دەستور ناوی دەیان(١٤) مەڵبەندی زانیاریی و صەدان زانای بەرزمان بەرچاو ئەکەوێ ، کە ئەوانیش هیچ‌کات لە قافڵەی زانیاریی دوا نەکەوتون و لە هەمو قۆناغێکدا جێگە و رێبازی خۆیان دیاریی کردووە •

---

=

گەلێ شیعری جوانیان هەیە و نازناوی تایبەتی خۆیان لە شیعردا هەیە ، وەك ( فەوزیی ) نازناوی شێخ عومەر ، ( نجم ) نازناوی شێخ ( نجم‌الدین ) .

(١١) تەرەمار : بۆ ماوەیەك جێگای زانیاریی بووە و لە هەمو لایەکەوە فەقێ بە ناوبانگی مامۆستای بەرز مەلا صالحی تەرەمارییەوە چوون ، شێخ عەبدوڵلای خەرپانی لە کۆتاییی یەکێك لە دەس‌نوسەکانیدا دەس‌نیشانی ئەوە ئەکات کە لە تەرەمار نوسیویەتیەوە.

(١٢) هەزارمێرد : یەکێکە لەو مەڵبەندە هەرەگەورانەی کە رۆناکی بە کوردستان داوە و ئەدیب و هونەرمەندی بەرزی تێدا پێگەیشتووە ، نمونەی بێتوشیی و شێخ مارفی نۆدێ و زانایانی تر لەو مەڵبەندە پیرۆزەوە مەشخەڵی ئەدەب و زانیارییان هەڵگرتووە و جیهانیان پێ رۆن‌کردووەتەوە .

(١٣) پێنجوێن : لەم مەڵبەندەدا زانای وەکو : مامۆستا مەلا ( عبدالرحمن )ی پێنجوێنی هەڵکەوتووە ، کە مامۆستا مەلا رەشیدبەگی بابان و مامۆستا مەلاحسەینی پیسکەندیی و چەندی وەك ئەوان بە شانازییەوە لە خزمەتیا خوێندویانە و ئیجازەیان لە لای وەرگرتووە .

(١٤) لەم جێگادا دەست لە نوسینی پەراوێزی مەڵبەندو فێرگەکان هەڵئەگرم و دەس‌بەردار ئەبم؛ چونکە ، زیاد لەوە کە سەرچاوەیەکی ئەوتۆ دەربارەی ئەم مەبەستە نیە ، ئەگەر بمانەوێ زیاتر لە باسەکە بکۆڵینەوە و قوڵتر بۆی بچین بە چەند بەرگ کتێب نابڕێتەوە و ، لێرەدا وەك نمونە ئەم باسەمان هێنا کایەوە . بەڵکو رۆژێك لە رۆژان زاناو لێ‌هاتوانمان قوڵی مەردانەی لێ‌هەڵماڵن و زانیاریی و بەسەرهاتی ورد و بە بناغە بەدی بێنن و ئەم کەلێنە گەورەی ( مێژوی زانیاریی و زانایانی کوردستان ) پڕ بکەنەوە و بەو کارە گرنگە چاوی خوێندەواری کورد رۆن‌بکەنەوە و زانایانی کوردیش بە جێگاو شوێنی پێ‌شیاوی خۆیان بگەیەنن .

ئەم هەمو مەڵبەند و فێرگانە بە درێژایی تەمەنیان ، بێ وچان ، لە ڕێگای پەرەپێدانی زانیاری و پێگەیاندنی مەلا و ئەدیب و هۆنەر و هونەرمەندی بەرزدا تێکۆشاون ، لە هەمان کاتیشدا ئەو فەقییانـــەی لەو جێگایانەدا بۆ خوێندن کۆبونەتەوە ، جگە لە فێربونی زانیاری و بـــەرز بونەوەی پلەی خوێندەواری هیـــچ مەبەست و ئامانجێکیان نەبـــووە • تەنانەت فەقێی وا هەبووە کە لە کەس و کاری بڕاوە و ڕێگای خوێندنی گرتووەتە بەر تا کاتی خوێندنی تەواو کردووە بۆ لای کەس و کاری نەگەڕاوەتەوە و بە نانەڕەقەی حوجرە و ڕاتبە ژیاوە و پێداویستیەکانی ژیانیشی ، بە گوێرەی سەردەمی خۆی ، لە وەقفی مەدرەسە و خێرومەندانەوە دەستکەوتووە • زیاد لەوە فەقێی وایش هەبووە پـــاش تەواوکردنی خوێنـــدن بە مەلایـــەتی لە دێیەك دانیشتووە و بۆ یەکجاری دانکەن و دەس‌بەردای خزم و کەس و کاری بووە •

شێوەی خوێندنیش لە مزگەوتـــانی ئەوسادا زۆر جیـــاوازی لەگەڵ خوێندنی ئێستادا هەبووە ، مەبەست پۆل بڕین و کتێب تەواو کردن و ئیجازە وەرگرتن نەبووە ، بەڵکو مەبەست فێربونی زانیـــاری و زانینی کتێبی پڕ وردەکاری و گران بووە ، بۆیە ئەگەر فەقێیەك چەند ساڵ بە کتێبێکەوە خەریك بوبێ ، یان چەند ڕۆژ لەسەر یەك ، یەك دەرسی خوێندبێ و دوپاتی کردبێتەوە جێگەی ڕەخنە و لۆمە نەبووە •

ئەمە شێوەی خوێندنی ساڵەهای ساڵی ناو کوردستان بووە و لەسەر ئەو ڕچە و ڕێبازە خوێندەواران فێری خوێندەواری بون و زانیاری بەو جۆرە پەرەی سەندووە و بلاو بووەتەوە • خوێندنێك بەو شێوە بوبێ و لێبڕانێك بەو ئەندازە گەیشتبێ ئـــەبێ زانای چۆن هەڵـــکەوتبێ ؟ ئەبێ ژمارەی ئەو زانا بەرزانە چەند بوبێ ؟ ئەبێ بەرهەم و دانراوی ئەو زانایانە تا چ ئەندازەیەك ڕۆیشتبێ ؟؟

بێگومان ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاری جۆراو جۆر لەم ڕێ و شوێنانەدا سەر هەڵدەدەن و خۆ دێننە پێش دەم ، بەڵام وەڵامی ڕاستی و

تەواوی ئەم پرسیارانە ـ ئەگەر بتوانرێ بدرێتەوە ـ بێ هەوڵ و کۆشش و دەرەتان و ماوەیەکی زۆر لە توانادا نیە ، چ جای باسێکی ئاوا کورت و سەرپێیی ، تەنها بۆ نمونە ناوی چەند مەلایەکی سەردەمێکی کەمی ناوچەیەکی کوردستان لەوانەیە بارستایی و قەوارەی ئەو هەمو زانا و خوێندەوارانە تا ئەندازەیەك پێش چاو بخات ؛ چونکە وەك پێشینان فەرمویانە : « مشتێ نمونەی خەروارێکە » .

لە دەور و بەری شاری سلێمانی و قەسەبچە و گوندەکانیدا لە دەور و بەری سەدەی (١٢)هەمی کۆچی و دوای ئەو سەدە وێنەی ئەم زانا و خوێندەوارانە هەڵکەوتون :

مەلا برایمی بیارەیی و ، شێخ (عبدالکریمی) بەرزنجی و ، شێخ (عبدالرحیم)ی برایی و ، مەلا (محمد) و مەلا (محمود)ی غەزائی و ، شێخ (عبدالله)ی خەرپانی و هەردو مەلا جەلالی خورماڵی و ، مەلا صاڵحی تەژەماری و ، مەلا (محمد)ی (ابن الحاج) و ، مەولانا خالیدی نەقشبەندی و، مەلا (عبدالله)ی ڕەش و ، شێخ (مصطفى) و شێخ سمایلی کوڕی و ، شێخ (محمد)ی خاڵی کوڕەزای و ، حاجی شێخ ئەمینی خاڵ و ، مەلا (عبدالرحمن) و مەلا (احمد)ی نۆتشی و ، موفتی زەهاوی و ، شێخ مارفی قەرەداغی گەورە و ، شێخ (عبدالرحمن)ی قەرەداغی و شێخ ئەمینی قەرەداغی و ، شێخ مارف و شێخ (عمر)ی کوڕی و ، شێخ (عبداللطیف)ی قەرەداغی و شێخ (عبدالرحمن)ی قەرەداغی (ابن الخیاط) و شێخ نەجیبی قەرەداغی و شێخ (مصطفى)ی کوڕی و شێخ (محمد)ە کۆستە و شێخ جامی و شێخ یوسف و شێخ باباعەلی تەکیەیی و ، بێنتوشی و شێخ مارفی نۆدێ و کاك ئەحمەدی شێخ و شێخ حسەینی قازی و مەلا (احمد)ی چاومار و ، مەلا ئەمینی کوڕی و ( سید عبدالعزیز )ی کوڕەزای و شێخ (مصطفى)ی موفتی و ، مەلا (عبدالرحمن)ی پێنجوێنی و ، مەلا (محمد)ی کەوانەدۆڵی و ، مەلا قادری کانیکەوەیی و ، (احمد فائز) و ، مەلا (احمد)ی

دێلێژەیێ و مـەلا (علی نیظـامێ) و ، مەلا عـەلی کانی‌کەوەیێ و ، (سید احمد)ی نەقیب و ، مەلا حەمەئەمێنی بالێکەدەرێ و ، مەلا (محمود)ە سۆر و ، مەلا حسـەینی پیسـکەندێ و ، مەلا ڕەشـید بـەگی بابان و ، مـەلا (عبدالرحمن)ی چورستانێ(١٥) و ٠٠٠٠ دەیان مەلای‌تر ٠

ئەمە نمـونەی هەندێـك لە زانایـانێ ناوچـەیەکی کوردسـتان لە سەردەمێکدا بوو ، وەك وتـمان بە ئەرك و دەرەتانێـکی زۆر نەبێ هیچ ڕەنگ نیە بتوانرێ ناوی زانایانی سەرتاسەری کوردستان بزانرێ ٠

کە ئاوڕێکیش بە لای پاشماوە و شوێنەواری ئەم مەلایانەدا بدەینەوە ئەبینین ــ مەگەر بە دەگـمەن ــ کە هەمێ تەئلیف و نوسـراوێ باشیان هەبووە ، بـەلام ، بەداخەوە ، زۆر کەمیـان ئەزانرێن و ، لـەوەش زۆر کەمتریان بە چاپ گەییـوە و خوێندەواران کەلکیان لێ وەرگـرتون ٠ کە دوبارە سەرنجێکی تر لە بەرهەمی ئەو زانایانە بدەینەوە ئەوانەی بە کوردێ شتیان نوسیبێ بە پەنجەی دەست ئەژمێررێن ، وەك : شێخ مارفی نۆدێو مەولانا خالیـد و ، شـێخ حسەینی قـازی و ، مامۆسـتا مـەلا حسەینی پیسکەندێ(١٦) ، و مامۆستا مەلا ڕەشیدبەگی بابان(١٧) و ، مەولەوێ و ، نالێ و ، سالم و ، کوردێ و ، چەند مەلایەکی تر ٠٠٠٠

بەلام ڕەنگە ئەم جۆرە حوکمە تا ڕادەیەك نا ڕەوابێ و ، لەوانەیە زۆر مەلای کوردی وا هەبێ ئەگەر خۆی لەم کاتەدا زیندو بوایە و ئەم باسەی

---

(١٥) بڕوانە ( الشیخ معـروف النودهی ) مامۆستا شـێخ محەممەدی خاڵ لاپەڕە ٨٤ .

(١٦) لەم ماوەیەدا کتێبێکی بچکۆلەی ئەم مامۆستایەم بە هۆنـراوەی کوردێ دەست‌کەوت .

(١٧) ئەم مامۆستایە خاوەنی گەورەترین کتێبی کوردییە کە تا ئێستا دانرابێ . ناوی کتێبەکەی ( اقتران النیرین في مجمـع البحرین )ە . تەرجەمەی حەدیثەکانێ پێغەمبەرە ــ د ــ کە لە ( مسلم )و ( بخارێ )دان . کتێبەکە برێتیە لە (١٠) بەرگ ، بەرگی یەکەمی بە سەرپەرشتی خۆم چاپ‌کراوە .

لەمن ببیستایە ، زۆر چاك لێم ڕاست ببوایەتەوە و ، پەنجەی بۆ ناو چاوم بهێنایە و بیگوتایە : ئەگەر تۆ تواناى ئەوەت هەیە شت ساخ کەیتەوە و ئەنجامی مەبەست و کارت بە تەواوی بدۆزیتەوە ، هەستە لە پێشدا بە وردی بگەڕێ و هەمو جێگەیەك بپشکنە ، ئەگەر هیچت بەدەست نەهێنا ئەوسا حەق بەتۆیە چی بلێی ؛ بۆ تۆ نازانی من فلانە ساڵ لەسەر فلان باس نامەیەکی درێژم بە کوردی نوسی ؟ فلانە مەلای تر لە فلان مێژودا لەسەر فیسار باس کتێبێکی گەورەی دانا ؟؟ بەڵگەی ئەمەش : تا دوێنێ و پێرێ ، بەڵکو تا بلاو بونەوەی ئەم نامیلکە ، هەمومان لەو بڕوایەدا بوین کە (ابن الحاج) کەلیمەیەکی کوردی سەر کاغەز نەنابێت و ئەگەر لێمان بپرسرایە : (ابن الحاج) دانراوی کوردی هەیە یان نا ؟ بێ سێ و دو ئەمانوت : ( نەء ) • بەلام وەك ئەبینین ئەم دانراوەی (ابن الحاج) لە پڕ سەر هەڵئەدا و ئەوەمان ئەخاتە دڵ کە ڕەنگە زۆر مەلای کورد شتی باشیان بە کوردی نوسیبێ ، بەلام یان سوتاوە و دڕێنراوە و لە ناوبراوە ، یان تا ئێستاش هەر لە ناو سنوقی لە بیرچون و لەسەر ڕەفەی پشت گوێ خستندا ماون و دلۆپە و دۆرنج و مشك و مۆرانە هەڕەشەی لەناوبردنیان لێ ئەکەن و دەستی دۆست نیە ڕزگاریان بکا و چاوی خوێندەواری کوردیان پێ گەش کاتەوە(١٨) •

ئەمانە هەر گلەیی و بناشت و هیوای شتی دورن ، ئەوەی من لەم کاتەدا لە توانامدا بێ با درێغی لێ نەکەم و ئەم نامیلکە بچکۆلەی مامۆستا (ابن الحاج) بۆ خوێندەوارانی کورد بلاو بکەمەوە •

---

(١٨) لەم چەندانەدا لە کتێبخانەی مۆزەخانە ( متحف )ی عێراقی دۆسێ فەقێی هەولێری کتێبی دەسخەتیان هێنابو ، منیش هەروا چاوم پیائەگێڕان کەچی لە پڕ دو دەسنوسی کوردیم بەرچاو کەوت ئەوە یەکەمجار بو ئەمبینین ، بەلام پاش ئەوەی گەیبونە دەست ئەو کتێبخانە نەدەکرا لێیان وەرگرم .

### ناوەرۆکی نامیلکەکە

دانەری ئـەم نامیلکەیە لە سـەرەتاوە باسی ئەوە ئـەکا کە ئەیەوێ بەگوێرەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ـ د ـ باسی فیتنەی دونیا و سەرەتای هاتنی ڕۆژی قیامەت بکا و ، ئـەڵێ : هەرکەس ئەهـلی ئیمان بێ ئەزانێ ئاخرزەمان نزیکەوە بووە و گەلێ لە نیشانەکانی دەرکەوتون و ، هەرکەس بیر و هۆشی بێ ئەبێ بۆ خـۆی بگرێ و لە هەولی ژیانـدا نەبێ و مردن بکڕێ ، پاش ئەوە دەست بە هەڵدانی نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت ئەکا و هەر لە دەججالەوە دەست پێ ئەکات و باسی چۆنیەتی و نیشانەکانی نزیکبونی هاتنی ئەکات و ، دوایی باسی هاتنی سوفیان و مەهدی و شەڕی نێوان ئەوان و لەناوچـونی سوفیان و سـەرکەوتنی مەهدی و بـڵاو بونەوەی ئاسایش و خۆشی بەجیهاندا ئەکات. دوایی دێتە سەر ئەوە کە پاش ماوەیەك دەججال پەیدا دەبێ و فیتنـەیەکی یەکجار گەورە بەرپـا دەبێ خەڵکێکی زۆری شوێن ئەکەون و لە پاشان حەزرەتی عیسا دێتەخوارەوە و دەیکوژێ. دوای ئەوە یەئجوج و مەئجوج و بـەڵا و ناخـۆشی ئەوان و ، پاش ئەوە پەیدابـونی « دابە » و گەڕانـەوەی ڕۆژ و داخـرانی دەرگای تەوبە و بەرزبونەوەی قورئان و هاتنی دوکەڵ و ، پـاش ئەوانە هەڵکردنی بایەکی گەورە لە شامەوە کە هەمو خەڵك دەمرێنێ و کەس نامێنێ و دوای ئەوەش زیندو بونەوەی خەڵك .

لە کۆتاییدا ئەڵێ : کە لە سـاڵی (١١٧٦)دا ئەم کتێبـەی بۆ کەڵکی عەوام و پلە نزمانی خوێندەواری کورد داناوە و ، خۆی ناوی ( محمد )ە .

تەواوی نامیلکەکە (١٥٧) چوارینە ، واتە : (٣١٤) شیعرە .

### باوەڕ بە ڕۆژی قیامەت

باوەڕ بە ڕۆژی قیامەت ( ڕۆژێك کە ئـەم جیهانە سـەرانسەر ، بە

فەرمانی خودا ، تێك ئەچێ و ، جگە لە خوا کەس نامێنێ ) یەکێکە لەو خاڵە سەرەکیانەی کە مەرجن بۆ باوەڕکردن بە خودا ، هەمۆ ئایینە ئاسمانیەکان لەسەر ئەوەن کە هەرکەس باوەڕی بەو ڕۆژە نەبێ ، باوەڕی بە خودا دانامەزرێ و پێی ناگوترێ خاوەن باوەڕی تەواو .

ئاینی ئیسلامیش ــ دوا ئایینی ئاسمانی ــ هەمان مەبەستی دۆپات کردووەتەوە و پێغەمبەری ئیسلام ــ د ــ ئەم مەبەستەی بە موسوڵمانان ڕاگەیاندووە و گەلێ نیشانەی فەرمووە کە ئەو نیشانانە هەمۆ یەکە یەکە و بەرو دوا پێش ڕۆژی قیامەت دێنە دێ و ئەوانە بەڵگەی هاتنی ئەو ڕۆژەن. لەم بارەیەوە گەلێك حەدیث لە پێغەمبەرەوە ــ د ــ ڕیوایەت کراوە و زانایانی ئیسلام ئەم باسەیان گەلێك بە گرنگ گرتووە و زۆر بە فراوانی لێی دواون و زۆر کتێبیان لەسەر داناوە ، گەلێك زانای وا هەبووە هەر هەواڵێك دەربارەی ئەم باسە کە نەگەیشتبێتە جێگەی متمانە و تەواتور پشت‌گوێیان خستووە تەنها ئەو هەواڵانەی کە سۆر زانیبێتیان ڕاستن و لە پێغەمبەرەوە ــ د ــ هاتۆن نۆسیویانە و بە بنەڕەتی ئەو مەسەلەیان زانیوە ، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك زانای وا هەبووە بێ وردکردنەوە و لێکۆڵینەوە هەمۆ هەواڵێکیان دەربارەی مەسەلەکە نۆسیوە، زانایانی کوردیش ــ وەکو هەمۆ زانایانی جیهان ــ دەربارەی ئەم باسە بە هەردۆ جۆر ، بە زمانی عەرەبێ دواون و کتێبیان لە سەر داناوە ، بەڵام بە زمانی کوردێ دەربارەی ئەم باسە تائێستە شتێکی ئەوتۆ نەنۆسراوە و ئەم دانراوەی ( ابن الحاج ) یەکەم نۆسراوێکی کوردیە لەم بارەیەوە .

**نرخی ئەم نامیلکەیە**

پاش تۆزێك سەرنجدان گرنگی ئەم نامیلکەمان لەم خاڵانەدا بۆ دەردەکەوێ :

١ــ بە لەهجەی موکریانێ ( ئەو لەهجەی ئەم کتێبەی پێ دانراوە ) تا

ئێستە، جگە لە فۆلکلۆر، هیچ ئەدەبێکی نوسراو نیەو ، تازە لەم لەهجەیەدا هەندێ شتێ فۆلکلۆرێ ئەنوسرێتەوە ، واتە ئەمــە وێنەی یەکەمی ئەدەبی تۆمارکراوی لەهجەی موکریانە •

٢ــ ئەو عەروضەی ئەم کتێبەی پێ دانراوە ، لــە ئەدەبی نوسراوی کوردیدا ــ جگە لە شــیعرەکانی ( ئێل بەگی‌جاف ) و ( احمدی کۆر ) ــ وێنەی نیە و نەبیسراوە • ئەبێ ئەم جۆرە عەروضــە لە سەردەمێکدا باو بوبێ و شیعری پێ هۆنرابێتەوە ، بەلاّم ســەرەتای ئەو ســەردەمە و ، ئەو هۆنراوانەی بەو جۆرە هۆنراونەتەوە و ، ئــەوانەی کە لەســەر ئەم ڕچە و ڕێبازە ڕۆیشتون و تاکەی ئەم شــێوە دەوامی کردووە ، تا ئێســتە هیچی دەربارە نەزانراوە •

٣ــ یەکەم موحاوەلەیەکە بە زمانی کوردی بۆ بەکارهێنانی شیعر لە مەسائیلی دینێ و فێرکردن و بلاّوکردنەوەی بیری ئاینی بەزمانی کوردی •

٤ــ مێژوی دانانی ئەم کتێبە بۆ پتر لە ( ٢٢٠ ) ساڵ ئەگەڕێتەوە •

٥ــ بە گوێرەی ئەوەی کە ئــەم هۆنراوەیە هێ « ابن الحاج »ەو ، ئەویش مامۆســتای بێتــوشێ و شــێخ مارفی نۆدێ بووە ، ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە « ابن الحاج » یەکەم کەسێکە لە ناوچەی سلیمانیدا کوردی نوسینی فێری فەقێیان کردبێ و ئەو هەستەی لە دەرونیاندا بزواندبێ ، تا لە نوکی خامەیانــەوە چۆبێتە ســەر لاپەڕەی کتێب ؛ چونکە بێتوشێ(١٩) و

(١٩) لە ڕاستیدا بێتوشی ــ ئەوەی تا ئێستە زانرابێ ــ یەك شیعری کوردێ هەیە ، بەلاّم بڕوا ناکرێ ئەوێك هەستی ئەوەی بوبێ شیعری کوردێ بنوسێ بە یەك شیعرەوە وەستابێ ، بەلاّم گەڕانی زۆری و ، دوری لە خوێندەواری کــورد و ، ژیانی لە ولاّتێکدا کە زمــانی کوردێ تێدا لە بێتوشێ بیســترابێ و ، دەرچونی لە جیهان لە ئاوارەییــدا و ، نەبونی وەسائیلی هاتــوچۆی گــورج و گوڵ لەو ســەردەمەدا باشــە ئەو تاکە

=

نۆدێیی ، یەکەم کەسێکن لە ناوچەی سلێمانیدا بە کوردی شتیان نوسیبێ و زۆری خوێندنیان لای « ابن الحاج » بووە •

٦ــ سەلماندنی ئەوەی کە ناوچەی سەردەشت ( جێگەی لە دایك بونی ابن الحاج ) پێش کوردستانی ئەمدیو هەستی نوسینی کوردی تێدابووە •

٧ ــ سەرەڕای ئەوانەی باسمان کرد ، ئەم کتێبە کەلەپورێکی ئەدەبێ گەلێکە کە لە ئەدەبی کوردیدا زۆر فەقیر و بێ مایەیەو ، سامانی ئەدەبێ کۆنەکراوەتەوە و پێویستێ زۆری بــە لێکۆڵینەوە و کەو و بێژنگ هەیە • بۆیە ئــەم دانراوە ــ هەرچەند گەلێ شتی وای تیایە بەو شــێوە جێگەی باوەڕ نیە ــ گەلێك بە نرخەو شتێکێ زۆر نایابە و پێویســتیەکی زۆرێ بە ژیاندنەوە و لێکۆڵینەوە هەیە •

**دەسنوسی یەکەم**

ئەم دەسخەتە لە دەور و بەری ساڵی ( ١٢٨٠ )ی ك نوسراوەتەوە • کە تۆزێك سەرنجی ئەم دەسخەتە بدەین ئەوەمان بۆڕون ئەبێتەوەــهەرچەند خۆی هەشت لاپەڕەیە ــ بە خەتی ســێ کەس نوســراوەتەوە ؛ یەکەمیان ئەوەندە بە شێوەی عەرەبێ نوسیویەتەوە تەنانەت سەر و ژێریشی بۆ کردوە کەچی دوەهەم و سێهەم وا نین • بەڵام بەداخــەوە وەك هەرسێکیان نیمچە

=

شیعرەشیان بۆ بەجێ‌هێشتوین کە ئەم بیرەی لە عاســتدا بکەینەوە . ئەوەی شایانی باسە لەم ڕۆژانەدا لای مەلا مەحمــود ئەحمەد قوتابی پۆلی پێنجەمی کۆلیجی ئیمامی ئەعزەم دو پارچە شیعری ( فارسێ )م بینی لە پێشیانەوە نوسرابو ( ملا عبدالله البیتوشی الملقب بـ ( مجمر ) ) واتە « هۆنراوەی مەلا عەبدوڵلای بێتوشێ کە نازناوی ( مەجمەر )ە » . ئەم شیعرانە تا ئێستا بــڵاو نەکراونەتەوە و ئەو نازنــاوەی بێتوشێیش نەبیسراوە . هەروەها شایانی باسە کە مەلا یوسفی گەبەیێ سورداشێ هەمان نازناوی بەکارهێناوە .

خوێندەوار بۆبن وایە و ، دەستێکی زانای شارەزایان لەگەڵ نەبووە ؛ بۆیە ئەتوانین بڵێین : دەس نوسەکە پڕە لە هەڵە و جێگەی وا کە وەك مەتەڵ دۆزینەوە نەبێ ساخ ناکرێتەوە ، ئەمە کاتێکی زۆری خۆم و کەسانی شارەزای ئیملای کۆنی برد ، کە یارمەتیان دام •

**چۆنیەتی ساخکردنەوەی**

١ـ وەکو وتمان دانراوەکە هەڵەی زۆری تیایە• لەبەر ئەوە نەمتوانی لە هەمو جێگایەکدا دەستنیشانی هەڵەکان بکەم ، ئەگەر چەند جێگەیەك دیاری کرابێ وەك نمونە وایە •

٢ ـ بە گوێرەی توانا لەو ئیملایەوە کە پێی نوسراوەتەوە گۆڕیمە سەر ئیملای کوردیێ ئێستە •

٣ ـ لە ساخکردنەوەیدا پەنام بۆ سەرچاوەیەکی عەرەبی برد ، ناوی ( الاشاعة لاشراط الساعة )یەو دانراوی مامۆستا ( شێخ محمدی بەرزنجیە)(٢٠) زیاد لەوە کە زۆر لە شارەزایانی کوردیێ کۆن زۆریان

---

(٢٠) ئەم مامۆستایە کوڕی شێخ « عبدالرسول » ، کوڕی « عبدالسید»ی ، بەرزنجیە ، لە شەوی جومعەی ١٢ای مانگی مەولودی ساڵی (١٠٤٠)ی ك لە بەرزنجە هاتووەتە جیهانەوە ، لای باوکی و مەلا زێرەك و مەلا محەمەد شەریفی کوڕی یوسفی صدیقی شاهۆیێ و ، مەلا ئیبراهیمی گۆرانێ و گەلێ زانای تر خوێندویە و کەڵکی لێوەرگرتون ، لە پاشان ماردین و حەڵەب و یەمەن و دیمەشق و میصر و بەغدا و گەلێ شوێن بۆ خوێندن گەڕاوە ، دوای ئەوە کە خوێندنی تەواو کردووە چووەتە شاری مەدینە و لەوێ جێنشین بووە . بە ماوەیەکی کەم گەورەیی و خوێندەواریێ لە هەموان ئاشکرا بووە و لە ڕەوضەی پیرۆزدا بووە بە مامۆستا و لە هەمو لایەکەوە فەقێ بە دەنگی زانیارییەوە هاتون و زۆر بە پەرۆشەوە لە کۆڕی دەرسوتنەوەیدا بە چۆکاهاتون و لە دەریای بێ پایانی زانستی کەڵکیان وەرگرتووە . ئەم زانایە جگە لەو هەمو دەرسوتنەوە و ، جگە لەوەی =

یارمەتی داوم • بە تایبەتی مامۆستا شـــکور مســـتەفا ئەندامی یاریدەدەری (کۆڕی زانیاری کورد ) ،کە بە تەواوی دەسخەتەکەی لەگەڵ خوێندمەوە•

٤ ـ لەو دەسنوسەدا کە لەپێشدا دەستمکەوت هیچ جۆرە ئیشارەیەکی بۆ ناوی کتێبەکە تێدا نەبو ، بەڵام ـ وەك باسی ئـەکەین ـ لەم دواییەدا

---

=

زۆری کاتی بە وەڵامی پرسیار و فتوای شەرعەوە بەسەر بردووە ، بارەی نوسین و کتێبدانانی لەبیر نەکردووە ، بەڵکو زۆر بەگەرمی ئەم لایەنەشی گرتووە و پتر لە ( ٩٠ ) بەرگ کتێبی پاش خـۆی بەجێهێشتووە لەو کتێبانە :

١ ـ الاشاعة لاشراط الساعة .
٢ ـ انوار السلسبيل في شرح اسماء التنزيل .
٣ ـ الضاوی علی صبح فاتحة البیضاوی .
٤ ـ المصطلح علی الفية السیوطی .
٥ ـ النواقض للروافض .
٦ ـ مرقاة الصعود في تفسیر اوائل العقود .
٧ ـ الجاذب الغیبی الی الجانب الغربی .
٨ ـ خالص التلخیص .
٩ ـ تحصیل الامام .
١٠ ـ النفحة الفائحة .
١١ـ سدادالدين في الدرجـات والنجاة للوالـدين ... و .. گەلێ دانراوی کە .

وەکو وتمان ، ئەم زانا بەرزە بە زۆری زانیاری بێ پایانی و ، خو و ڕەوشتی جوانی و ، خزمەتکردنی بە فەقێ و هاوەڵانی و ، دەم و زمانی شیرین و وتـاری بەرز و جـوانی لە جیهانی ئەو سـەردەمەدا دەنگی دابووەوە و لە هەمو لایەکی جیهانی ئیسلامیەوە هەرکارێکی گرنگ یان مەسئەلەیەکی یاخی ببوایـە بۆ لای ئەبراو ئەویش بـە زوترین کات و جوانترین شـێوە و ڕاسـتترین وەڵام پـەردەی لە ڕوی مەسـەلەکە هەڵئەماڵی و بێ گرێ و توێکڵ ئەیدایەوە دەستیان . بەم شێوەیە ئەم زانایە ( ٩٩ ) ساڵ تەمەنی بەسەربرد تا لە ( ١١٠٣ )ی ك دا لە شاری مەدینە لە جیهان دەرچو و لە خاکی بەقیع لە گۆڕستانی بەرزنجیەکان

=

نوسخەیەکی کەی هەمان کتێبم دەس کەوت بە ڕۆنی ناوی (مەهدیێ نامە)ی بۆ دانابۆ بۆیە ئێمەش ئەو ناوەمان بۆ دانا •

**دەسنوسی دووەم**

کاتێك ئەم نامیلکەیە هەرچیم بۆ لەگەڵ کرابۆ کردبوم و پێشکەشی

---

=
بەخاك سپێررا . ( بڕوانە : «ترجمـة المصنف» لە کتێبی «الاشاعه»دا چاپی «مطبعة المشهد الحسینی» قاهیرە سالی ١٣٨٤ ) .

پێش ئەوەی باسـی مامۆستای بەرزنـجی بپێچێنەوە ، یـەك دۆ قسەی مامۆستای ناوبراو لە کتێبێ ( الاشاعه )دا هەیە لەوانەیە سۆدی باشیان لێ وەربگێـرێ ، بۆیە نۆسێنیان لێرەدا بـە پێویست ئەزانم . مامۆستای بەرزنجێ ئەلێ :

« لە کاتێکدا من منداڵ بۆم لە شاخەکانی شارەزۆردا لە دێی (ئەزمك) محەممەد ناوێك پەیدا بۆ ئەیوت : من مەهدیم و خەڵکێکی زۆری شوێن کەوت ، تا مێری ئەو وڵاتە ئەحمەد خانی کوردێ هێرشی بردە سەری و شکاندی و براکەی گـرت و دێکەیانی وێـران کرد و محەممـەد خۆی ڕای کرد و کۆمەڵێك لە شوێن کەوتووانی کوژران و هەرچێشیان مانەوە سۆك و بێ نرخ بۆن . دوایی زانایانی کورد لێی کۆبۆنەوە و فتوایان بە کوفری دەکرد و ئیمانیان پێ تازەکردەوە و ، سەر لەنوێ ژنەکانییان لێ مارەکردەوە ، ئەویش تەوبـەی کرد و لـە کارەکەی گەڕایـەوە ؛ بەڵام هەندێك لەوانەی کە نزیکی بۆن و تێکەڵاوییان لەگەڵی بووە ئەیانوت : هەر بە ڕواڵەت گەڕاوەتەوە و بە دڵ هەر لەسەر بێر و ڕا کۆنەکەیەتی » .

« من لە سـاڵی ( ١٠٧٠ )كدا لەگـەڵی دانیشـتم ، دیـم پیاوێکی خواپەرستی لە خواترس بۆ ، لە جل و بەرگ و خواردنیا خۆی زۆر لە حەرام ئەپاراست ، براکەی کە لەسەر ئەو گیرابۆ زۆر لۆمەی ئەکرد و لێی ناڕازی بۆ . . . »

وە هەر لەپاش ئەم قسە ئەفەرموێ :

« بە ماوەیەکی کەم پێش دەستکردنم بە دانانی ئەم کتێبە پیاوێکی کورد لە شاخەکانی «عقره» و «عمادیه» پەیدا بۆ ، ناوی «عبدالله» بۆ ، =

( کۆڕی زانیاری کورد )م کردبۆ و بڕیاری له چاپدانی درابۆ و لەوەدا بۆ بخرێته ژێر چاپەوە، لەپڕ لای برادەرێکەوە نوسخەیەکی نایابی ئەم نامیلکەیە سەری هەڵداو ، هەر بە هەواڵزانینی ، بە پەلـە ، ڕۆم لـە ( کۆڕ ) کردۆ کتێبەکەم وەرگرتەوە و ، دۆبارە لە سـەرەتاوە پێداچۆمـەوە و هەرچی جیاوازییەکی نێوان دۆ نوسخەکە بۆ لە پەراوێزەوە دەس نیشانم کرد .

لەبەر ئەوەی نوسخەکەی لای خۆم کۆنتر بۆ و زۆتر نۆسرابووەوە بە ئەصلم دانا و بە (١) ئیشارەم بۆ کرد و بۆ ئەم نوسخە بە (٢) ئیشارەم کرد .

ئەم نوسخەیە بە خەتێکی زۆر جوان نۆسراوە و نۆسەرەکەی گەلێ بەسەرنج بووە و ، گەلێ جـار دەس نیشـانی جیاوازێ چەنـد نوسخەی کردووە .

ئەوەی لەڕاستکردنەوەی عیبارەتـەکاندا یارمەتیدەرێکێ بـاش بێ ئەوەیە نۆسەر وەك نۆسـێنی عەرەبێ بە وردی سـەر و بۆری بۆ هەمۆ شیعرەکان کردووە .

گەلێ کەس دەسیان بۆ ناو کتێبەکە بردووە و قەڵەمیان تێدا گێڕاوە و مانای گەلێ وشـە و جێگەیـان لێکداوەتەوە ، بەڵام ، بەداخەوە ، ئەوەی جێگەی سەرنج بێ ئەوەیە ئەو نۆسەرانە لێکدانەوەکەیان ــ لەگەڵ ئەوەدا کە کوردییان زانیوە و مانای کوردییان لێکداوەتەوە ــ یان بە فارسێ یان

---

=

ئەیوت : ئەو پیاوێکی شەریفی حسەینیە ، کوڕێکی بچکۆلەی دە دوازدە ساڵانەی بـۆ نـاوی نابـۆ « محمـدی مەهـدێ » ، خـەڵکێکی زۆری شوێن کەوت و ، هەندێ قەڵا و شتی گرت . والێ (موصل) بۆی سوار بۆ و شەڕ و خوێنڕژان لە نێوانیاندا ڕۆی دا ، دوایێ کۆمەڵی (مەهدی) شکان و باوك و کوڕ گیران و بە دێلێ ڕەوانەی ئەستەمۆڵ کران . دوایێ سولطان لێیان خۆش بۆ و گەڕانەوەی لێ قەدەغە کردن و هەردۆکیان لەوێ مردن » .

بڕوانە لاپەڕە ( ١٢١ ) «الاشاعە» .

به عەرەبی بووە • زیاد لەوەی ئەم دەســخەتە ــ جگە لــە یەك چوارتین ــ تەواوی دەسخەتی(١)ی تێدایە،گەلێ جێگەی زیادیشی تێدایە کە لەنوسخەی (١)دا نیەو منیش ئەو زیادانەم هەمو نوســی و لە پەراوێزەوە دەسنیشانی ئەو جێگایانەم کردە بە داخەوە ــ زیاد لەوە کە ئەم نوسەرە بەرێزە ئەڵێ ناوم ( محمد )ە ــ هیچ باس و ناونیشانێکی خۆی نالێ • ئەوەندەش ئەڵێ کە لە شەوی یەكشەممە لە ( ساوجبلاغ ) نوسیویەتیەوە • لەم دەسنوسەدا ناوی چەند کتێبێك لە حاشیەکانیدا هەیە کە یان ناویان نەبیسراوە یان زۆر کەمن وەك : ( حوض النهــــر ) و ( عنبر الفــایح ) و ( مخزن الدرر ) و ( زینة الواعظین ) • ئەم دەسنوسە لە ساڵی ( ١٢٨٨ )ی ك دا نوسراوەتەوە •

## ( ابن الحاج ) کێیە ؟

(ابن الحاج) زانای گەورە و ، ئەدیبی پایەبەرز و ، شەرع زانی کەم وێنە و ، (محدث)ی بەناوبانگی کورد مەلا محەمەدی کوڕی حاجی حەسەنە ، خەڵکی دێی (سنجوێ)ی سەر بە ناوچەی سەردەشتە •

سەرەتای ژیانی ئەم زانا گەورەیە نەزانراوە(*) تەنها ئەوەندە نەبێ کە لە سەرەتای ژیانیا و پاش تەواوکردنی خوێندن لە دێی (سنجوێ) بۆ ماوەیەك دەرسی وتوەتەوە و زاناو خوێندەواری پێگەیاندووە • پاش ئەو ماوەیە لە بەر هۆیەکی نەزانراو (کەم وابووە مەلایەك پاش ئەوەی لە جێگەیەکدا بوبێ بە مامۆستا ــ بێهۆیەك ــ ئەو جێگەی خۆی بەجێهێشتبێ و بۆ وڵاتێکی تر ، یا بۆ جێگایەکی دور چوبێ) جێگە و شوێنی خۆی بەجێهێشتووە و هاتووەتە دێی (هەزارمێرد)ی نزیکی تانجەرۆ و سلێمانی و لەوێ دەستی بە

(*) لەگەڵ چیرۆکێکدا لــە مامۆستایەکم بیست کــە مامۆستا ( ابن الحاج ) ماوەیەك لە (بصره) قازی بووە . بەڵام کەی بووە ؟ نازانرێ !

دەرس‌وتنەوە کردووە و لە هەمو لایەکەوە فەقێ بە پەرۆشەوە بۆ خزمەتی هاتون و لە کۆڕی دەرس‌وتنەوەیا بەوپەڕی ئەدەبەوە دانیشتون و لە دەریای بێ‌پایانی دوڕ و گەوهەریان وەرگرتووە و شەو و ڕۆژیان لەخۆیان هەراسان کردووە بۆ ئەوەی کاتیان لەکیس نەچێ و زیاتر کەلْك لەو سەرچاوە ڕونە وەربگرن •

وەکو وتمان هیچ بەلْگەیەکمان دەربارەی سەرەتای ژیانی (ابن الحاج) بە دەستەوە نیە ، هەروەها ژیانی کەس و کاری و چۆنیەتی بنەماڵە و جێگا و شوێنی ، بەلاّم لە نێوە شیعرێکی کتێبەکەیەوە کە ئەفەرموێ : « زاتیومە بە ئێرثییەتێ » • ڕون و بێگومان ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە ئەم زانایە لە بنەماڵەیەکی ئایینی کۆن بووە و پشتاو پشتیان بە زانای بەرز و خوێندەواری چاك هاتونەتە خوارەوە و هەمیشە کەلّە پیاو و شاسواری مەیدانەکانی زانیاری بون و هەمو یەکێکیان گەیوەتە ئەو پلەیە کە پێی بوترێ : (محدث) و ، زانیاری حەدیث پشتاو پشت بە ئیرث بۆ یەکتر بەجێ‌بهێلّن • بۆ پلەی (ابن الحاج) ئەوەندە بەسە کە ئەدیب و زانایانی وەکو مامۆستا مەلا « عبدالله »ی بێتوشی و شێخ مارفی نۆدێ قوتابی ئەو بون لەسەر سفرە و خوانی ئەدەبی ئەو تویشوی ئەو ئەدەبە بەرزەیان هەلْگرتووە کە جێ و شوێنێکی تایبەتیی هەیە•زیاد لەوە کە بێتوشی ئەو پارچە هۆنراوە بەرزەی کە تائێستەش لە عەرەبیدا وێنەی نەهۆنراوەتەوە و بە یەکێك لە شاکارە هەرە بەنرخەکانی ئەدەبی عەرەبی ئەژمێررێ ، وەکو نامەیەك ، بۆ (ابن الحاج)ی مامۆستای ناردووە(٢١) •

مامۆستای گەورەمان وەك چەرخ و سەردەمی خۆی بەلْکو زیاتریش هەر بەلایەنی دەرس وتنەوە و زانای گەورە پێگەیاندنەوە نەوەستاوە و

---

(٢١) سەرەتای ئەو پارچە هۆنراوە ئەمەیە :

**« یا سیدی زاد اکتسابی في الهوی    کربی علا من زفرتی وعویلی »**

بڕوانە «البیتوشی» مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ لاپەڕە ( ٤٤ ) .

ئەسپی خۆی لە گەلێ مەیدانـدا تاو داوە و ، لە هەمۆ ئـەو مەیدانانەشدا شاسوار بووە •

یەکێك لەو مەیدانانە شتێکی کەمی لێ بزانرێ مەیـدانی تەئلیف و کتێبدانانە ، لـەم ڕووەوە (ابن الحاج) گـەلێ کتێبی لە زانـیاریە جۆراو جۆرەکاندا داناوە و دانـراوەکانیشی بە چاکتـرین کتێبی بابـەتی خۆیان ئەزانرێن •

بەڵام گومان لەوەدا نیە ــ وەك مێژۆی ژیانی نازانرێ ــ زۆری کتێب و نوسراوەکانیشی تا ئێستە نەناسراون و ڕەنگە زۆریشیان بێ سەر و شوێن لەناوچوبن ، بەڵگەی ئەمەش ئەم کتێبەیە کە پێشکەش بە خوێندەوارانی ئەکەین ، کە تا ئێستە هیچ سەرچاوەیەك لەوانـەی باس لە (ابن الحاج)وە ئەکەن ناویان نەهێناوە و بەلایدا نەچوون • جا ئەبێ چەند کتێبی وا بە نرخی لەناو چوبێ و ؟ ئەبێ دیوانی شیعر و هۆنراوەی چی بەسەرهاتبێ ؟

بە هەرحاڵ ئەوەندەی پێمان بکرێ سەرنجی خوێندەواران بۆ ئەم باسە ڕائەکێشین و ئـەوە ئەڵێین : پیاوێك بـەو هەمۆ زانیاریەوە ، بـەو هەمۆ ئەدەبەوە ، دانراوی شیعری زۆری هەبێ ، هۆنـراوەی کوردیشی هەبێ ، ئەبێ دیوانی شیعری ــ عەرەبی یا کوردی ــ نەبێ ؟ ئەبێ بۆ گەلێ بابەت و موناسەبە هۆنراوەی نایابی نەوتبێ ؟ ئەبێ پیاوێك بێنوسێ ئەو نامە بەرزەی بۆ ناردبێ بە نامەیەکی لـەوە بەرزتر یا وەك ئـەوە وەڵامی نـەدابێتەوە ؟ بێگومان خوێنەرانی بەڕێزیش لەگەڵ مندا ئەڵێین : ( نابێ ) ، بەڵام ئایا ئەبێ لەمەولایش مێژۆی ئەم زانایە هەروا بە نادیاری بمێنێتەوە ؟ من لام وانیە ئەگەر هەوڵ بۆ کۆکردنەوەی پاشماوەکانی بدرێ گەلێ شتی بەنرخ وەدەس نەکەوێ •

سەرەڕای ئەمانە بۆ ڕێزی ئەم زانایە هەمیشە ئەوە لەبیـر ناکرێ کە یەکەم کەسە ــ تا ئێستە ناسرابێ ــ بەو کێش و لەهجە و عەرۆضەی باسمان

کرد شیعری کوردیٚ هۆنیبێتەوە ٠

ئەوا لە خــوارەوە نــاوی دانــراوە پێ زانــراوەکانی پێشــکەشی خوێندەوارانی بەڕێز ئەکەین :

١ ـــ نظم محاسن الغرر ٠
٢ ـــ شرح نظم محاسن الغرر ٠
٣ ـــ رفع الخفا عن ذات الشفا ٠
٤ ـــ حاشیەی (مدونه)ی لەســەر کتێبیٚ (البهجة المرضـية في شرح الالفية) ٠

٥ ـــ الشمائل : تاکە نوسخەی ئەم کتێبە تازە لەگەڵ چەند کتێبێکدا بە کتێبخانەی مۆزەخانەی عێراقی فرۆشراوە ٠

٦ ـــ ایقاد الضرام على من لم یوقع طلاق العوام(٢٢) ٠
٧ ـــ رسالة في بيان المقصور والممدود ٠
٨ ـــ رسالة (المحذوفات)(٢٣) ٠
٩ـــ ئەم کتێبە کە پێشکەش بە خوێندەواران ئەکرێ « مەهدی نامە » ٠

---

(٢٢) مامۆستا بێتوشی ( تقريظ ) بە بەربڕینێکی زۆر جوانی بۆ نوسیوە .

(٢٣) ئەم نامیلکەیە تازە لــەم ماوەیەدا سەری هەڵـداوە و تا ئێســتە هیچ سەرچاوەیەك باسی لێ نەکردووە . تەنها وێنەی ئەم کتێبە لای برادەری خۆشەویستم مامۆستا محەممەد مەلا ئەحمەد گەزنەییە .

## بسم الله الرحمن الرحيم

یارەب(١) تۆیی صاحیب هودای(٢)<br>
وەقتێ دەبین فیتنە بەدای<br>
حیفظن(٣) بکەی ( یا ذا الندا! )<br>
بە ئیسمی تۆ بیدایەتێ(٤)

بیدایەتم بە ئیسمی تۆ<br>
لە ذیکری فیتنەی خەلقی تۆ

---

(١) ( یا ڕەب تۆیی ... ) مامۆستای ( ابن الحاج ) لە سەرەتای ئەم کتێبەوە بە پێچەوانەی یاسای دانەر و نوسەرانی ئەو سەردەمەوە دەستی پێ‌کردووە ؛ چونکە ئەوان ( دێباچە )یەکی فراوانیان دروست کردووە و بە حەمد و ثەنا و سوپاسی خوا و ، داوای ڕەحمەت بۆ پێغەمبەر و یارانی ... دەستیان پێ‌کردووە ، ئەم شێوە تا ئێستەش لە نوسینە ئاینیەکاندا هەر زۆرە ، بەلام مامۆستا ( ابن الحاج ) تەنها بە پاڕانەوەیەك لە خوا دەستی پێ‌کردووە .

(٢) هودای = هودا : هەر وەك خۆی نوسیمان ؛ بەلام بە ( هودا ) ڕاسترە ؛ چونکە ( هودای ) لەسەر شێوەی ( ئەلفی مەقصورەیە )و ئەوەش لە کوردیدا دەست نادا . بۆ ( بەدا )یش هەروای نۆسیوە ، بەلام لە ( نەدا )دا پەیڕەوی ئەوەی نەکردووە .

(٣) ( حیفظن ) نونەکەی نونی ( جەمع ) کۆمەلە و ، ڕەنگە لە ( حیفظمان )ەوە وردە وردە ( میم ) و ( ئەلفە )کە ڕۆیبن و ( حیفظن ) مابێتەوە .

(٤) لە نوسخەی ( ٢ )دا ( هودا ) و ( بەدا ) بێ ( ی ) نوسراون .

ویفقی حەدیث(٥) نەبیی تۆ
زانیومە بە ئیرثییەتێ(٦)

هەرچە کەسێ(٧) ئەهلی ئیمان
لە جوملەیێ جین و ئینسان
دەزانێ هات ئاخیر زەمان
فەوتاوە بابی ڕاحەتێ

ڕاحەت لەکوێ بۆ ئینسانی ؟
خوصوص لە ئاخیر زەمانی
پوڕ لە ظوڵم و بێ ئیمانی(٨)
کەوتوینە دەرگیهی فیتنەتێ(٩)

---

(٥) ( ویفقی حەدیث ... ) واتە : باسی فیتنەیەك تۆشی خەڵك ئەبێ بەگوێرەی حەدیثی پێغەمبەری تۆ دەستی پێ ئەکەم . ( حەدیث ) بەبێ ( ێ )ی ( اضافە ) لە بەر کێشی شیعرەکەیە ، ئەم جۆرە زاراوە لە ناو گەرمیاندا بێ پێویست و ( ضەرۆرێ )یش هەر زۆرە . وەك : « بە قەور پێغەممەر ، وە سەر باوکت ... »

(٦) ( زانیومە بە ئیرثییەتێ ) وەك لە پێشەکیەکەدا باسمان کرد ، بە ڕۆنی ئەوەمان بە دەستەوە ئەدا کە ( ابن الحاج ) زانایەکی زۆر بەرز بووە لە ( عیلمی حەدیث )دا و ، بەڵکو ( محدث )بووە و ، نەك تەنها خۆیشی بەڵکو پشتاو پشتی هەر بە زانای بەرزی ( حەدیث ) هاتۆنەتە خوارەوە . مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵیش لە باسی ژیانی ( ابن الحاج )دا دەس‌نیشانی ئەوە ئەکا کە ( محدث ) بووە بڕوانە ( البیتوشی ) لاپەڕە ( ١٧ ) .

(٧) هەرچە کەسێ ( ٢ ) هەرکەسێ چی

(٨) بێ ئیمانی ( ٢ ) بێ ئەمانی .

(٩) کەوتوینە ..... ( ٢ ) کەوتینە دەرکی فیتنەتێ .

ئینسان ئەگەر تێبفکرێ
دەبێ بۆ حاڵی خۆی بگرێ(١٠)
ژینی نەوێ مەردەنێ بکرێ(١١)
لەمێ(١٢) دەوری مەعصیەتێ

دونیا هەر بە خۆی(١٣) فیتنەیە
ئەو عەدووی ئەهلی خوەیە(١٤)
داوی دانا لەبۆ مەیە
ئینسان طەیرە دەیکەوێتێ

دەیکەوێتێ پۆلی ئینسان(١٥)
غالیب دەبێ نەفس و شەیطان
عاصی دەبن(١٦) لەبۆ ڕەحمان
فیکەر(١٧) ناکەنە قیامەتێ

قیامەت لەمە نەزدیك(١٨) بووە
ئینسان تەمام غافڵ بەوە

---

(١٠) بگرێ ( ٢ ) بیگرێ .

(١١) مەردەنێ بکرێ ( ٢ ) میردنی بێتکرێ .

(١٢) لەمێ ( ٢ ) لەوێ .

(١٣) بەخۆی ( ٢ ) بۆخۆی .

(١٤) ( ئەهلی خوەیە ) دەگونجێ ( خوەیە ) مەبەست خودابێ و لەبەر کێش و قافیەی شیعرەکە وای لێ کردبێ .

(١٥) پۆلی ئینسان ( ٢ ) پۆلپۆل ئینسان .

(١٦) دەبن ( ٢ ) دەبێ .

(١٧) فیکەر ... ( ٢ ) فیکرێ ناکە لە قیامەتێ .

(١٨) نەزدیك ( ٢ ) نیزیك .

نیشـــانه‌یه(١٩) ویـم ظاهــیر بـــه‌وه(٢٠)
بـــۆد(٢١) به‌که‌م (٢٢) وه‌صـــف و عه‌لامــه‌تێ

یـــه‌ك لـــه عه‌لامـــه‌تانی ده‌ججـــال(٢٣)
ئـــه‌و کافـــری ( شـــق )ی(٢٤) به‌طال(٢٥)

---

(١٩) نیشانه‌یه ... ( ٢ ) نیشانه‌یێ ظاهیر بووه .

(٢٠) ( غافل به‌وه )و ( ظاهیر به‌وه ) به‌گوێره‌ی سه‌ر و بۆرێك بۆیان کراوه نوسیمان ، به‌لام له هه‌ردوو لادا ( بووه ) بێ چاکتره و له‌گه‌ل ( نه‌زدیك بووه )ش باشتر ئه‌گونجێن .

(٢١) ( بۆدبکه‌م ) = بۆت‌بکه‌م . دال و تێ له ( مه‌خره‌ج )دا له یه‌که‌وه نزیکن بۆیه له گه‌لێ جێگه‌دا یه‌ك له جێگه‌ی یه‌ك به‌کار ئه‌هێنرێن ، ( وه‌فایێ ) به زۆری ، به‌لکو هه‌میشه ، له‌باتێ ( بتگرم ) یا ( بتبینم ) ( بدگرم ) و ( بدبینم ) به‌کار ئه‌هێنـێ ( ئه‌مـه به گوێره‌ی ده‌س‌نوسـێکی کۆن که له‌لامه ، نه‌ك به گوێره‌ی دیوانه چاپه‌کان ) . ئه‌م ئال و گۆڕه‌ی دال و تێ له زمانێ عه‌ره‌بیشـدا هه‌ر زۆره ، بـه‌لام ته‌نـها له گفتـوگۆدا نه‌ك له نوسیندا . وه‌ك ( قد تبین ) و وێنه‌ی ئه‌مه به مه‌رجێ ئه‌وه‌ی پیتی یه‌که‌م ( ساکن ) بێ .

(٢٢) بۆدبکه‌م .... ( ٢ ) بۆت‌که‌م وه‌صفی عه‌لامه‌تێ .

(٢٣) ده‌ججال : هه‌ندێ که‌س ئه‌لێن : ناوی ( صافی ) کـوڕی ( صیاد )ه ، به‌لام ـ وه‌ك خاوه‌نی ( الاشـاعة ) ئه‌لێت ـ ڕاسـت ئه‌وه‌یه که ( ابن الصیاد ) نه‌بێ و ، یه‌کێکه له نـه‌وه‌ی شیقی کاهـین ، یان هه‌ر شیق خۆیه‌تی . گـوایا دایکی شـیق جیننێ بـووه و عاشقی بـاوکی بووه و شیق له دوو توخمی جیننێ و ئاده‌میزاد په‌یدابـووه ، دوایێ شه‌یاطین شتێ سه‌یر سه‌یریان بۆ کردووه ، تا حـه‌زره‌تی سلێمان گرتویه و له دورگه‌یه‌کدا حه‌بسی کردووه .

له‌قه‌بی ( مسیح )ه ؛ چونکه زۆر ئه‌گه‌ڕێ ، به‌لکو هه‌مو جیهان ، جگه له مه‌ککه و مه‌دینه ، ئه‌گه‌ڕێ . صیفه‌ت و خوی ( دجل ) شت‌گۆڕین و ڕاستی هه‌لگه‌ڕاندنه‌وه و درۆیه گه‌لێ ناونیشانی بۆ باس ئه‌کرێ ، له : زلێ و ، قـژلولێ و ، یه‌ك‌چـاوێ و سواری‌که‌ر بـون و ... تاد پێی ئه‌وترێ : ( شیق ) چونکه یه‌ك چاوی هه‌یه و ، چـاوه‌که‌ی که‌ی نیه و شوێنه‌واری نیه و لایه‌کی ( لوس و پوسه ) ، واته : یه‌ك لا ، یان نیوه

=

تابیعـــی ویـــن(٢٦) ئەهـــلی ضـــەلال
خـــــۆ داوێتـــــە هیـــــلاکەتێ

دەبـــێ لـــە پێش ئـــەوێ(٢٧) شـــەیطان
بەهەفت ســاڵ دێ(٢٨) مەهــدێ زەمــان(٢٩)

---

=

زەلامە . جیهان ئەگەڕێ و فیتنەیەکی زۆر بڵاوئەکاتەوە و خەڵکی زۆری شوێن ئەکەوێ و ، داوای خوایەتێ ئەکا و ، هەرکەس بەگوێی نـەکا ئازاری ئەدا .

(٢٤) ( شیق ) : ئەگونجێ بخوێندرێتەوە : ئەو کافرەی شەقێ بەطاڵ ، یان : ئەوکافرەی . . . ، بەڵام وەك لە پەراوێزی پێشوودا ڕوونمان کردەوە (شیق) باشترەو ، ئەوکاتەش ، لەسەر شێوە نووسینی کۆن ، جۆرە (تەوریە)یەکی تێدایـــە .

(٢٥) (شیق) ( ٢ ) شەقی و ، شیقی و .

(٢٦) وێن (٢) وێ .

(٢٧) ئەوێ (٢) ئەو .

(٢٨) بەهەفت ســاڵ دێ (٢)بە هەفتێ ساڵی .

(٢٩) ئەم مەهدیە پێغەمبەر ـدـ موژدەی بە هاتنی داوە و دێت و ، هاتنەکەی لە کاتێکدا دەبێ کە سەر زەمێن پڕ لە خراپە و فەساد و شەڕ و شـۆڕ دەبێ ، بە هاتنی ئەو و حوکم کردنی باری ژیان و ئێش و کاری جیهان ئەگۆڕێ ، خێر و خۆشی زۆر ئەبـێ . شـەڕ و ئاژاوە نامێنـێ ، خوا پەرستی بڵاو ئەبێتەوە . ئەم مەهدیە ناوی محەممەد یا ئەحمەدە ، باوکی ناوی «عەبدوڵلا»یە دایکی ناوی ئامێنەیە ، لە بەرەی هاشمە .

بۆیە پێی ئەوترێ «مهدی» ؛ چونکە خوا یـارمەتی ئەدات و ، سوپا و لەشکری زۆری لە دەور کۆ ئەبنەوە و لە ژێر ئاڵای ئەودا لە دژی شەڕ و خراپە ئەجەنگێن و پارێزی لێ ئەکەن .

ئەم مەهدیە جیایە لەگەڵ ئـەو مەهدیەدا کە شیعە بـاسی ئەکەن و باوەڕیان پێیەتی ، مەهدێ شیعە ( محەمەدی کوڕی حەسەنی عەسکەریە ) گوایا لە بیرێکدا لە سامەڕا خۆی شاردۆتەوە و کاتی خۆی دێتە دەرەوە . شیعە کە باسێ ئەم مەهدیە دەکەن یا ئەنووسن ، ئەڵێن : (عج) یـا (فج) وەك ئەوترێ : (ص) یان (ر) لە باتی (صلی الله علیه وسلم) ، یان (رضی الله عنه) ، مەبەستی ئەوانێش (عجل الله فرجه) یان (فرج الله عنـه) واتە : خوا زوو ڕزگاری کات و لە بەندێ بێر بێتەدەرەوە .

لەپێش مەهــدیٚ دەبـــیٚ ســـوفیان(٣٠)
مەعلـــوٚمە ئـــەو بـــە ڕیوایـــەتیٚ(٣١)

مەعلـــوٚمە ئـــەو بـــە ڕیوایـــەتیٚ(٣٢)
بـــە ڕیوایـــەتیٚ دەبـــیٚ مەعلـــوٚم

---

(٣٠) سوفیان نوٚسەری دەستخەتەکە گەلیٚ جار بە صوفیانی ئەنوٚسیٚ بەڵام ڕاستیەکەی سوفیانە و ئێمەش بە سوفیانی ئەنوٚسین .

(سوفیان) لە نەوەی خالیدی کوڕی یەزیدی کوڕی سوفیـانە ، لـە شێوی (یابس) لە دەور و بەری (دمشق) پەیدا دەبیٚ و خەڵکێکی زوٚر لە خاڵوانی ، کە بەرەی کەلبن ، لیٚی کوٚئەبنەوە ، شەڕو شـوٚڕێکی زوٚر ئەکاو ، بەغدا و کوٚفە و چـەندین شوێن ئەگریٚ و ، کوشتـارو تالاّن و بڕوٚیەکی زوٚر ئەکات . لەسەردەمی ئەوا مەهدی پەیدا دەبیٚ ، کـە ئەو هەواڵە ئەبیٚسیٚ خوٚی و سوپاکەی ئەچن بوٚ شەڕ کردن لەگەڵ مەهدی ، لە ڕێگەدا لای (قطیفە) خوٚی و ســوپای ڕوٚ دەچن . بڕوانە ( الاشاعە ) (٩٢)و پاش ئەوە .

(٣١) گەلێك ڕیوایەت لەو بارەوە هەیە ، هەندێـك ڕیوایەت حەوت ســاڵەو هەندێك زیاتر بڕوانە لاپەڕە (١٠٥)ی (الاشاعة) .

(٣٢) ئەم چوارێنە بە پێچەوانەی چوارێنەکانی کەوەیە و ، کـەم و کوڕێشی تیٚدایە ، بەڵام ، وەك خوٚی هێشتمانەوە .

بوٚ ئەو ڕیواتانەو ماوەی هاتنی ســوفیان بڕوانـە لا پەڕە (١٠٥) ی (الاشاعة) .

ئەوەی پێویستی نوٚســینە لێرەدا ئەوەیە کە لە ماموٚســتا مەسعوٚدم بیست کە لە منداڵیدا لە پیاوێکی بیستووە ، ئەم چوارێنەی بەم شێوەی خوارەوە خوێندوٚتەوە :

« بە ڕیوایــەتیٚ دەبیٚ مەعلـوٚم
بە شەشی دیٚ دەجاڵی شـوٚم
بە هەفتی دیٚ مەهدیٚ یەقـوٚم
قەت دەرناچیٚ لەو موددەتیٚ »

بــه بیســت ســاڵ دێ ســوفیانی شــۆم(٣٣)
قــەط دەرنــاچێ(٣٤) لــەو مــوددەتێ

بەڵــکە خــەبەر وامــان دەبیســت(٣٥)
لــە شــێخی ماهــیر(٣٦) و موثبیــت
بــە پانصــەدی(٣٧) ســوفیان دەبیــت
ئەهــلی فیســق و ضــەلالەتێ(٣٨)

نیشــانەی ســوفیان و دەجــال :
کــەم دەبــێ عــالم زۆر دەبــێ ( جهّال)(٣٩)
بــە دونیــایێ زۆر ئیشــتیغال
دەکەونــە بەحــری غەفلــەتێ

غەفلــەت یەکجــار تەمــام دەبــێ
مانــگی(٤٠) وەکــو جومعــە دەبــێ(٤١)

---

(٣٣) بەم شیعرەی ( ٢ ) ئەو نارێکیە لە پەراوێزی سەرەوەدا دەس‌نیشان‌کرا تەواوئەبێ : «بە یازدەی دێ سوفیانی شۆم »
«بە هەفتی دێ مەهدێ مەعلوم »
(٣٤) قەط دەرناچێ ( ٢ ) قەد دەرناچێن .
(٣٥) بەڵکە ... (٢) بەڵکی خەبەر وەهامان بیست .
(٣٦) ماهیر و (٢) ظاهیر و .
(٣٧) بە پانصەدی ... (٢)بە هەفتدی ...
(٣٨) ضەلالەتێ (٢) فەسادەتێ .
(٣٩) کەم دەبێ ... (٢) کەم دەبێ عیلمو زۆر جەهال .
(٤٠) (مانگی وەکوو جومعە دەبێ) واتە : خەڵك ئەوەندە سەریان قاڵ ئەبێ و وا باوەش بە دونیادا ئەکەن و ئەوەندە بەگەرمێ بە ئێش و کارەوە خەریك ئەبن نازانن کات چۆن تێپەڕ دەبێ و کاتێ مانگێك تەواو ئەبێ وا ئەزانن هەفتەیەك تێپەڕ بووە .
بڕوانە (١٢٩) (الاشاعة) .
(٤١) مانگی ... (٢) یەك مانگ وەکو جومعە دەبێ .

ئــــەرض بولـــــەزە(٤٢) زۆر دەبـــــێ
دەكــــــەن تـــــــالآن ئەمـــــــانەتێ

دانـــــی زەكـــــات دەبـــــێ گـــــران
زۆر دەبـــــێ غەیبـــــەت و بوهتـــــان
كـــــەم دەبـــــێ ڕەحمـــــی(٤٣) خزمـــــان
نـــــادەن بـــــە یـــــەكدی ئولفـــــەتێ

چـــێ فاسـق بـێ ئـەو بـە حورمـــەت
پیـــاوی دەچـــاك دەكـــەن ( ظلـــت )(٤٤)
كـــەم دەبـــێ لـــە ئـــەرض بەرەكـــەت
پەیـــدا دەبـــن(٤٥) لـــــەم حالـــــەتێ

خوێنـــدن بـــۆ جاه(٤٦) و مـــاڵ دەبێ
تەصـــدیق(٤٧) هـــەر بـــە زوبـــان دەبـــێ
پیـــــاو بـــــە قســـــەی ژنـــــێ دەبـــــێ
بـــە كەیفـــی داكـــی(٤٨) نایـــەتێ(٤٩)

لـــە پـــاش ئـــەوەی ســـوفیان دەبـــێ
ـ لـــە نەســـلی ( صخر )ی بـــنی ( حربێ )

---

(٤٢) ئەرض بولەزە (٢) ئەرضی بولەرزە .
(٤٣) کەم دەبی ڕەحمێ (٢) کەم دەبێتن ڕوحمێ .
(٤٤) (ظلت) زیللەت ڕاستیەکەیەتی ، واتە : پیاوی فاسق بە ڕێـز و بەرز و جێگەدیاری ئەبێ و ، پیاوی چاك ڕسوا ئەبێ .
(٤٥) پەیدا دەبن (٢) پەیدا بۆن ئەو .
(٤٦) خوێندن بۆ جاه و (٢) خوێدین بۆ جاو .
(٤٧) تەصدیق (٢) صیدق .
(٤٨) داکی (٢) دایکی .
(٤٩) (بەکەیفی داکی نایەتێ) دایکی چی پێ خۆش بێ ئەو وا ناکا ، یان خۆشی لە چارەی دایکی نایەت و بە قسەو کردار و ڕای تۆڕە و ئالۆز ئەبێ .

خـالّی دەوێـن(٥٠) حەبیـی ( کلبێ ) ـ(٥١)
دەکـا لـە شـام حوکومـەتێ(٥٢)

کـە خـورۆج بکەن تـورك و گـورجێ(٥٣)
لای مـزگەوتی شـام ڕۆدەچـێ(٥٤)
نەزدیـکە(٥٥) سـوفیان دەربچـێ
دەبـێ وەقتـی ئەمـارەتێ

دەکـە (٥٦)(٥٧) خـورۆج سێ‌صەد سـوار
بـۆی دێ لـە خـالّان(٥٨) بیست هەزار(٥٩)

---

(٥٠) دەوێن (٢) دەوێ .
(٥١) بەرەی (کلب) خالّی سوفیانن . تەماشای لاپەڕە (٩٢)ی (الاشاعة) بکە .
(٥٢) (لە پاش ئەوەی ... تاد) واتە : سوفیان پاش هـاتنێ لە ولاّتی شـام حوکم ئەکا . بڕوانە (٩٢)ی (الاشاعة) .
(٥٣) (تورك) و (گورجێ) لە (الاشاعة)دا بە (الابقع) و (الاصهب) ناو ئەبرێن و ، دوایێ مامۆستای (بەرزنجی) مانایان بە تورك و ڕۆم لێك‌ئەداتـەوە و ، ئەڵێ : ئەبقەع و ئەصهەب (صیفات) و (ئەلقاب)ن‌و نـاونێن . واتە ئەبێ (کرج = گورج) مامۆستای (ابن الحاج) لە کوێی وەرگرتبێ ؟ ئەبێ ئەمـە صیفەتێکی تایبەتێ ڕۆم بوبێ و تا ئەو سەردەمەش لەناو کوردا زانرابێ و دوایێ لەبیرکرابێ ؟ (٩٢) الاشاعة .
(٥٤) ڕۆدەچێ ( ٢ ) ڕۆچێ .
(٥٥) نەزدیکە ( ٢ ) نیزیکە .
(٥٦) دەکە ( ٢ ) دەکا .
(٥٧) ( دەکە ) یان ( دەکا ) لە بـاتی ( دەکەن )ە ، لە کوردیـدا زۆر وا ئەبێ جیاوازێ لە نێوان کۆمەڵ ( جەمع )و تاك ( مفرد ) ا ناکرێ ، بە تایبەتی کە کۆمەڵەکە ژمارە بێت وەك ئەوترێ : « صەد سـوار هات » و « دە زەلام ڕۆیێ ... » .
(٥٨) ( لە خالاّن ) مەبەست خاڵوانیەتی کە بەرەی ( کلب )ن . لە ( الاشاعة )دا (٣٠) هەزار ئەڵێ نەك (٢٠) هەزار ، بڕوانە لاپەڕە (٩٢) .
(٥٩) بیست هەزار ( ٢ ) سێ هەزار .

لـــــه عـــــێراقێ جه‌نـــــگ و بنـــــار
ده‌كـــــه‌ن تـــــالاّنی كۆفـــــه‌تێ

كه كۆفـه‌ی گـرد(٦٠) ، بـردی(٦١) تـالاّن
یه‌خســـــیری مـــــاڵ و منـــــدالاّن
بـــه مه‌دینـــه ده‌خـــا(٦٢) ( جـــولان )
خه‌ڵـــقێ ده‌خێتـــه(٦٣) ضـــه‌یقه‌تێ

ســـێ ڕۆژ تـــالاّن لـــه مه‌دینـــه(٦٤)
خوێـــن ده‌ڕێـــژێ(٦٥) لـه زه‌مینـــه(٦٦)
لـــه هاشـمیان ده‌كـــرێ قێنـه(٦٧) ، (٦٨)
ده‌چنـــــنه كێـــوان لـــه ده‌هشـــه‌تێ

لـه میحـرابی ( دمشـــق ) و ( شـام ) (٦٩)
له ســه‌ربه‌ڕی(٧٠) یـــه‌كزه‌ن(٧١) ( مـدام )
چـه بڵـــێ مه‌كـــه ، كوشـــتنی لیـزام
لـــــه غـــــایه‌تی جه‌هالـــــه‌تێ

---

(٦٠) ( كۆفه‌ی گرد ) مه‌به‌ستی ( گرتنه ) بڕوانه په‌راوێزی ( بۆد بكه‌م ) .
(٦١) گرد بردی ( ٢ ) گیرت كردی .
(٦٢) ده‌خا ( ٢ ) ده‌خێ .
(٦٣) ده‌خێته ( ٢ ) ده‌یخێته .
(٦٤) مه‌دینه ( ٢ ) مه‌دینی .
(٦٥) ده‌ڕێژێ له زه‌مینه ( ٢ ) ده‌ڕژێنێ له زه‌مینی .
(٦٦) ( خوێن ده‌ڕێژێ له زه‌مینه ) ڕه‌نگه ( له‌و زه‌مینـه ) بێ و واوه‌كه‌ی له بیر كرابێ .
(٦٧) قێنه ( ٢ ) قێنی .
(٦٨) ڕق و قێنه بۆیه له هاشمی‌یان ئه‌كرێ ، چونكه مه‌هـدێ له‌وان په‌یدا ئه‌بێ و ، ڕه‌نگه سوفیان بزانێ به هاتنێ مه‌هدی ئه‌و له‌ناو ئه‌چێ ، بۆیه كوشتاریان لێ ئه‌كا به‌رهه‌ڵستی له هاتنی مه‌هدێ بكا .

=

غالیب دەبێ جەیشی سوفیان
لە ڕۆم و فارس و خۆراسان
خۆ ون دەکەن ئەهلی ئیمان
لە بەر زەحمەتی(٧٢) شیددەتێ

هاشمییەك برای مەهدێ
لە خۆراسانێ دێ بە توندێ
بە پێنج هەزار سواری مەردێ
طالیب بۆ مەهدێ صوحبەتێ

ئەو جەوانێکی(٧٣) یەکجار توندە
عەسکەریشی یەکجار مەردە
ئەوێ کاتی دەبێ هەددە(٧٤)
سوفیان بەوێ دەنگێوێتێ

هەژدە مانگان(٧٥) دەکا شەڕێ
بە مەهدێ دەدا(٧٦) خەبەرێ

---

=

(٦٩) بۆ ( دمشق و شام ) سەر و بۆر کراوە ، بەڵام دیمەشقی شام ڕاسترە .

(٧٠) ( لە سەربەڕی ... ) واتە : لە میحرابی دیمەشق و شام عەرەق خواردنەوە و پیاڵە گۆڕێنەوە ئەبێ .
( لەسەر بەڕی ) بە ڕێنوسی کۆن هەڵدەگرێ ( بەڕی ) بێ وەك هەڵدەگرێ ( بەڕەی ) بێت . بە هەردوو شێوە مەبەست بەرماڵ و ڕاخەری مزگەوتە .

(٧١) یەكزەن مدام ( ٢ ) یەكژین مودام .

(٧٢) زەحمەتی ( ٢ ) زەحمەت و .

(٧٣) جەوانێکی ( ٢ ) مەردێکی .

(٧٤) ئەوێ .... ( ٢ ) ڕوو بێکاتە کێو دەبێ هەدا

(٧٥)مانگان ( ٢ ) ماهان .

(٧٦) بە مەهدێ دەدا ( ٢ ) لە مەهدێ دەزانێ .

دەنـــــكەونە يــەك لــە « أصــطخر »ێ(٧٧)
ســـــوفیان دەچێتـــــە زیـــــللەتێ

لـەو پـاش تەقدیـر وەهــا(٧٨) دەبـــێ
قەضـــای ڕەببـــی قـــەط ڕەد نـــابێ
جەیشـــی هاشـــم شـــكست دەبـــێ
دەشـــــكێ دەچێتـــــە مەككـــەتێ

وەقتـــێ هاشـــمی(٧٩) مـــیر دەبـــێ
هەرتـــا(٨٠) مەهـــدێ مەعلـــوٙم دەبـــێ
شـــەش ســالآنێ نێـــوان(٨١) دەبـــێ
وەهـــا مەعلوٙمـــە بـــە ڕیوایـــەتێ

غالیـــب دەبـــێ فیتنـــەی شـــرروٙر(٨٢)
ڕێ دەگـــیرێن نـــزدیك(٨٣) و دوٙر
هەفـــت عالمـــی(٨٤) ئەهـــلی شـــوعوٙر
دەیـــەن هـــەر یـــەك لـــە جیهـــەتێ

هـــەر یـــەك لـــە جیهـــەتێ دەیـــێ
هەمـــوان سێصـــەد لەگـــەڵ(٨٥) دەیـــێ

---

(٧٧) دەنكەونە یەك : بەیەك ئەگەن .
(٧٨) تەقدیر وەها (٢) موقەددەر وا .
(٧٩) هاشمی (٢) هاشیم كە .
(٨٠) هەرتا (٢) هەتا .
(٨١) سالآنی نێوان (٢) سالآن نیوەدان .
(٨٢) فیتنەی شروٙر (٢) فیتنە و شوروٙر .
(٨٣) نزدیك (٢) نیزیك .
(٨٤) عالمی (٢) كەس عالم .
(٨٥) لەگەڵ (٢) دەگەڵ .

بــــۆ خەبــــەری مەهــــدیٚ دەیــــیٚ
لاقــــی(٨٦) دەبــــن بــــە مەککــــەتیٚ

لــــە مەککــــەی دەبێنــــن یەکــــدیٚ
هەمــــوٚ طالیــــب لــــە بــــۆ مەهــــدیٚ
دەڵــــێن : دەزانــــین تــــۆ مەهدیــــیٚ(٨٧)
بــــە نیشــــانە و عەلامــــەتیٚ

دەکــــا حاشــــا ئــــەو دەردەچــــیٚ
هەڵــــدیٚ وە مەدینــــە دەچــــیٚ
ئــــەو جەمعییــــەت لــــە دوٚی دەچــــیٚ
دیســــان دەچێتــــە مەککــــەتیٚ

لەکــــن مەقــــامی حەجــــەریٚ
دوٚعــــا دەکــــا هــــەر دەگــــریٚ
دەڵــــێن : دەبــــیٚ مــــیری بــــگریٚ
یــــان دەتــــکوژین بــــە شــــیددەتیٚ

لە ترســــان دەســــت درێــــژ دەکــــا
بەیعــــەت لەگــــەڵ قەومــــیٚ دەکــــا(٨٨)
دوٚ ڕکعەتیــــان نوێــــژ بــــۆ دەکــــا(٨٩)
بۆیــــان دەخوێنــــیٚ خوطبــــەتیٚ

---

(٨٦) لاقی ( ٢ ) لاقا .

(٨٧) دەڵێن ... ( ٢ ) دەڵێن : زانین ئەتۆ مەهدیٚ .

(٨٨) بەیعەت ... ( ٢ ) قەوم بەیعەتی دەگەڵ دەکا .

(٨٩) دوٚ ڕەکعەتیان .... ( ٢ ) دوٚ ڕەکعەتان نوێژ دەکا .

خوطبەی کە خوێند کردی تەمام(٩٠)
ئەو مەهدیێ شیرین کەلام
ئەهلی یەمەن کوفییی و شام
بۆیێ دەگرن جەمعییەتێ(٩١)

جەماعەت پێی دەبن سەرخۆش(٩٢)
مەهدیێ ڕدێن پڕی(٩٣) چاو ڕەش
دندان وەکو ئەستێرەی گەش
خاڵی هەیە لە ڕومەتێ

لە مەککەی دەبێ بە وەلەد(٩٤)
ناوی « محمد »(٩٥) ، « احمد »(٩٦)
لە لای ڕاستی خاڵی ئەسوەد
لە ئەولادی فاطیمەتێ

ڕومەتێ هەر وەك گەوهەری
ناوی دایکی هەم پەدەری
هەر بە میثلی پێغەمبەری
شیبهی وییە لە خیلقەتێ

---

(٩٠) خوطبەی کە خوێند ( ٢ ) کە خوطبەی خوێد .

(٩١) بۆیێ دەگرن .... ( ٢ ) دەگرن لەوێ جەمعیەتێ .

(٩٢) دەبن سەرخۆش ( ٢ ) دەبێ دڵخۆش .

(٩٣) پڕی چاو ڕەش ( ٢ ) ئەبرۆ چاو ڕەش .

(٩٤) لە مەککەی دەبێ بە وەلەد ( ٢ ) لە مەدینەی دەبێ وەلەد .

(٩٥) « محمد » « احمد » ( ٢ ) « محمد » و (( احمد )) .

(٩٦) ئەم شێوە نوسینە بە دو ڕیوایەت ئیشارە ئەکا ، ئەگەر بنوسرێ ناوی « محمد » یا « احمد »ە باشترە .

یەکجار حەڵیم لە بوغز(٩٧) دوور
خەڵقی زۆر پێی دەبێ مەسروور
داخلی ویٚ حوبب و سرور(٩٨)
حاکمی پڕ عەدالەتێ

قسەی خراپ قەط نابێژێ
خوێنی ناحەق قەط نارێژێ
وەقتێ کەلام سست(٩٩) دەبێژێ
دەستی دەدا لە ڕوکبەتێ(١٠٠)

دەنگێك ظاهیر دەبێ(١٠١) لە ئاسمان
دەڵێ : « امیرکم فلان »
یەعنی مەهدیٚ نەك وەك سوفیان
شادی لە بۆ دیٚ(١٠٢) ئوممەتێ

لە موعجیزەی پێغەمبەری
اللە حورمەت نا لەسەری
ئەبدالی شام گەورەی میصری
هەمو دەکەن ئیطاعەتێ

---

(٩٧) بوغز ( ٢ ) بوغزیٚ .

(٩٨) داخلی وی . . . ( ٢ ) داخیل دەبێ حوببی صودوور .

(٩٩) کەلام ( ٢ ) کەلامی . ( سست ) لە ( ٢ )دا نیە ، بەڵام بە گوێرەی « الاشاعة » ( ١ ) ڕاستە .

(١٠٠) کاتێ باش قسەی بۆ نەیێ دەست بە ئەژنۆی خۆیدا ئەدا .

(١٠١) دەنگێك ظاهیر دەبێ ( ٢ ) دەنگێ ظاهیر .

(١٠٢) لە بۆ دیٚ ( ٢ ) دەبێ بۆ .

کـــە ســـوفیان ئـــەو خەبـــەر دەبیێـــت(١٠٣)
جەیشـــی ئەســـــەر(١٠٤) مەهــــدێ دەچێــت
دەچــــێ لــــــە بەیــــدایێ دەخێــــــت
« فــــی لیلــــــة مقمـــــرتێ »(١٠٥)

بەیــــدا لــــە مەککـــەی(١٠٦) نزدیـــکە(١٠٧)
شـــوانێك زانــێ و هـــەر ڕا دەکـــا(١٠٨)
هـــەر دەچێـــت و هـــەر بانـــگ دەکـــا
« یـــا ویـــــح اهـــــل مکـــتێ »(١٠٩)

کـــە شـــوان لـــەوێ غـــایب دەبـــێ
جەیشـــــی ســــــوفیان خەســــف دەبـــێ
دەبیێتـــــەوە عەجـــــەب دەبـــــێ :
« ارتحلـــــوا فـــی ســـاعتێ ؟ ! » (١١٠)

---

(١٠٣) کە سوفیان .... ( ٢ ) کە سوفیانی خەبەری بیست .
(١٠٤) ئەسەر ( ٢ ) وەسەر .
(١٠٥) ( في ليلة ... ) لەشەوێکی مانگە شەودا .
(١٠٦) لە مەککەی نزدیکە ( ٢ ) لە کەعبەی نیزیکە .
(١٠٧) بەیدا : شوێنی دەشت و چۆڵ .
(١٠٨) زانێ و هەر ڕا دەکا ( ٢ ) دەزان ڕا دەکا .
(١٠٩) ( یا ویح .... ) واتە : ماڵوێران ئەهلێ مەککە .
(١١٠) « ارتحلوا في ساعتێ ؟ ! » لە مانای « أارتحلوا .... » دایە واتە : ئایا لە سەعاتێکدا کۆچیان کرد ؟ ! مانای تێکڕای شیعرەکە : ـ وەکو لە شیعرەکانی پێشەوەدا بۆ ـ کە شوانە بەهاتنی سوپای سوفیان ئەزانێ بە هەڵەداوان ڕۆ لە مەککە ئەکا و ، وەك هاواری ، ئەو هەواڵەیان پێ ڕائەگەیەنێ ، کاتێ ئەگەڕێتەوە سەری لەو کارە سۆڕئەمێنێ ؛ ئەو زۆر نیە ڕۆیوە ، هەمۆی ســەعاتێکە ، کەچی ئەو ســوپا گەورەیە لەوێ نەماوە ! ئایا ئەو سوپایە چێ لێ هات ؟ ئایا لە سەعاتێکدا هەمۆ باریان کرد ؟ وەك لەمەو پاش دەردەکەوێ . کە دەچێتە لای ( قطیفە ) ئەزانێ کە سوپاکە ڕۆ چووە . ١١٥ ( الاشاعة ) .

وەقتێ تەئەممولێ دەکا
نەظەر ئەمەنزڵێ(١١١) دەکا
ڕۆچونی وان یەقین دەکا
بە دینی لای قەطیفەتێ

ئەهلی مەککە دەبن سرور
دەکەن شوکری ڕەببی غەفور
خەسف کران ئەهلی شرور(١١٢)
دەزانین ئەو عەلامەتێ(١١٣)

مەهدێ لە مەککەیێ دەردێ
ئالاّی نەبیێ لە بۆ دێ
دوازدە هەزاری لەگەڵ(١١٤) دێ
« او عشر مع خمستێ »(١١٥)

جوبرەئیل چەرخەچی دەبێ
میکائیل دوندار دەبێ(١١٦)

---

(١١١) ئەمەنزڵێ ( ٢ ) وە مەنزەڵێ .
(١١٢) خەسفکران .... ( ٢ ) حیفظ کران لە ئەهلی شورۆر .
(١١٣) دەزانن ... ( ٢ ) دەزانن ئەو بە عەلامەتێ .
(١١٤) لەگەڵ ( ٢ ) دەگەڵ .
(١١٥) واتە : دوازدە هەزار یان پازدە هەزار ، بەگوێرەی جیاوازێ دوۆ ڕیوایەت .
(١١٦) ( چەرخەچی ) و ( دوندار ) دوۆ وشەی جەنگین و ئێستە بەکار ناهێنرێن و وەکوۆ لەبیرکراویان لێ هاتووە ، مستەفا بەگی کوردێ لە شیعردا بەکارێ‌هێناون وەك ئەڵێ :

**« ئەمان سەرقافڵەچی کاروان ، دەخیل سا چەرخەچی لەشکر جڵەو هەڵکێشە ، ڕەحمێ‌کە ، کە جارێکە و هەر ئەمجارە ! »**

=

ئـــەرض و ســـەما ســـەرخۆش دەبـــێ
قەصـــــدی وە شـــــام و هیجـــــرەتێ

فەرضـــــی عیشـــــا ئـــــەدا دەکـــــا
ئـــەووەڵ ڕۆ بـــە(١١٧) حیجـــاز دەکـــا
چـــی بەنـــدیە(١١٨) ڕەهـــــای دەکـــا
جـــەواب دەگاتـــــە(١١٩) کوفـــــەتێ

هەرکەس کە بە خەبەری(١٢٠) عالم بووە(١٢١)
جەیشـــی ئـــــەوێ خەســـــف بـــــووە
بـــە یـــەك نەفـــەر(١٢٢) خـــەلاص نەبووە
خـــــورۆج دەکـــــا لـــــە کوفـــــەتێ

دێتـــــە دەرێ عازیـــــم بـــــە شـــــام
جەیشـــــێ دروســـــت دەکـــــا تەمـــــام

---

=

وە پێش ئەم شیعرە ئەڵێ :
**« لە پێش بەیـداخی شـادی یـار ئـەوا ئەسـپی دەئاخێـوێ لەسـەر تێپـی سوپاسـالار و هـەم پێشـەنگ و دونـدارە »**
بڕوانە لاپەڕە ٦٨ی چاپی سێیەمینی دیوانی ( کوردی ) .

(١١٧) بە ( ٢ ) دە .
(١١٨) بەندیە ( ٢ ) بەندی بێ .
(١١٩) دەگاتە ( ٢ ) دەگا بە .
(١٢٠) بە خەبەرێ ( ٢ ) صەخرێ .
(١٢١) ( هەر کەسێ کە ... تاد ) ئەگەر بوترێ :
« هەرکەس بە خەبەری عالم بووە »
ئەوسا کێشەکە بە ڕەوانی ئەڕوا .
(١٢٢) بە یەك نەفەر ( ٢ ) یەك نەفەرێ .

لــه پێش مەهــدیّ داخــل بــه شــام
« القـــــی الیـــه ســـاعتیّ »(١٢٣)

بــه خەســفیّ ئیعتیبـــار دەکـــا(١٢٤)
بەیعـــەت لەگـــەڵ مەهـــدیّ دەکـــا
مەهـــدیّ وه قـــودس زۆ دەکـــا
ســیّ ســاڵ دەکـــا ئیقامـــەتیّ(١٢٥)

صـــەخریّ خـــاڵی وەعـــار دەخـــەن
نـــاقیض لـــه بـــۆ مەهـــدیّ دەبـــەن
موســـتەحەققی غەضـــەب دەبـــەن
واقیـــع دەبـــن بـــه زیـــددەتیّ(١٢٦)

ســـوفیان دەکـــا عـــەزمی شـــەڕیّ
مەهـــدیّ دەزانـــیّ خەبـــەریّ
جەیشـــی عەظیـــم دێتـــه دەریّ
ئـــالای عەظیم(١٢٧) ( مـــن مائتـــیّ )(١٢٨)

نەصـــرەت دەریّ(١٢٩) ڕەبیـــی غەفـــور
مەهـــزوم دەبـــن کەلبـــیّ شـــرور

---

(١٢٣) ( ساعتیّ ) ( ٢ ) ( طاعتیّ ) . « القی الیه ساعتیّ یان طاعتیّ » : واته :
یەکسەر فەرمانی مەهدیّ وەردەگرن و هیچ سەرپێچیّ ناکەن .
(١٢٤) ئیعتیبار دەکا ( ٢ ) وان باوەڕ دەکا .
(١٢٥) ئیقامەتیّ ( ٢ ) ئیطاعەتیّ .
(١٢٦) لێرەدا له ( ٢ )دا ئەم چوارینەی زیادە .
(١٢٧) عەظیم ( ٢ ) عیظام .
(١٢٨) ( من مائتیّ ) : گەورەترین سوپا له سەردەمی مەهدیدا له (١٠٠) کەس
پێکدیّ . بڕوانه (٩٨) (الاشاعة) .
(١٢٩) دەریّ ( ٢ ) دەرا .

« ثـــم يولـــــون الدبــــــر »(١٣٠)
« بشـــــرى لاهـــــل غـــزوتێ »

ئـــەولادی وان موســـــبا(١٣١) دەبـــێ
ســـوفیان لـــەوێ ئەســـتیر دەبـــێ
یەکڕۆی(١٣٢) بـــە هەشت شـایێ دەبێ(١٣٣)
« یذبـــح مثـــــل ســـخلتێ »(١٣٤)

زەبحـــی لـــە ژێـــر شـــەجەرەتێ
لەکـــن بەحـــری طەبەریـــەتێ
یـــا لـــە بـــورجی طۆریـــەتێ
خیـــلاف لـــە دۆ(١٣٥) ڕیوایـــەتێ

هـــەر کـــە کـــوژرا ســـوفیانی شـــۆم
غەنیمەتـــان دەکـــەن قوســـــۆم
فەتـــح دەکـــەن حوصـــۆنی ڕۆم
بـــە تەهلیـــــل و تەکبـــیرەتێ

---

(١٣٠) « ثم یولون ... » واتە : ئەشکێن و پشت هەڵ ئەکەن و ڕائەکەن ، ئەمە مژدەیەکی گەورەیە بۆ شەڕکەران . لە هەردۆ نوسخەکەدا « الدبر » بە « الدبور » نۆسراوە بەڵام هەڵەیە و ڕاستیەکەی بێ ( واو )ە .

(١٣١) موسبا ( ٢ ) سەبی .

(١٣٢) یەکڕۆی ( ٢ ) کیژیان ، بیکریان .

(١٣٣) یەکڕۆ : کە ئێستە بەکار ناهێنرێ تەرجەمەی ( عذراء )ە .
(شایێ) و (پەناباد) پارەی ئێرانن ، ئێستە ڕەواجیان نەماوە . لە (٢)دا نیوە شیعری دۆهەم و سێهەم هەر یەك لە جێگەی ئەوی تردایە و ئەوەش ڕاستە .

(١٣٤) ( یذبح .... ) واتە : وەکۆ بەرخ سەردەبڕرێ .

(١٣٥) لە دۆ ( ٢ ) دەوی .

جەور و زوڵمان(١٣٦) ڕیحلەت دەکا
عەدلی حوکمان سوکنا دەکا
دینی نەبێ قایم دەکا(١٣٧)
ناکا(١٣٨) خیلافی سوونەتێ

قوسطەنطینێ مەفتوح دەبێ
سێ ڕۆژ لەوێ هەر شەڕ دەبێ
جەیشی مەهدێ غالیب دەبێ
قیسمەت دەکەن غەنیمەتێ

شەیطان لەوێ صەرخ(١٣٩) دەکا
جەیشی مەهدێ ئیعلام دەکا
دەججال ئەوا(١٤٠) لە پاشەوە(١٤١)
یەخسیر دەکا زوڕییەتێ

لە قیسمەتێ بەتاڵ دەکەن
ڕوو بە ئەولاد و ماڵ دەکەن
ئەو خەبەری یەقین دەکەن
کە هەر کیذبی شەیطانەتێ

---

(١٣٦) زوڵمان ( ٢ ) زوڵم .
(١٣٧) قایم دەکا : واتە زیندوی دەکاتەوە و پەرەی پێئەدا .
(١٣٨) ناکا ( ٢ ) نابێ .
(١٣٩) صەرخ ( ٢ ) سیحری .
(١٤٠) ئەوا لە پاشەوە ( ٢ ) ئەوە لە پاش وەهات .
(١٤١) ( لە پاشەوە ) وەك لەمەولایش دەردەکەوێ ، دانەر قافیەی ( هێ ) و ( الف )ی بە جیاواز دانەناوە بۆیە لەگەڵ ( دەکا )دا ( پاشەوە )ی وتووە ، ئەم شێوە چەند جارێك لەمەولا دێت .

ڕۆمیـــــەیێ دەکـــــەن دیـــــار
شـــەهری عەظـــیم و بـێ شـــومار(١٤٢)
لێـی دەکـــوژن(١٤٣) شەش‌صـەد هـەزار
فەتتـــاح(١٤٤) بـــە دوّ تەکبیــرەتێ(١٤٥)

لەوێنـــدەرێ دەبـــن ڕەهـــا(١٤٦)
« بلـــدة ( قاطـــع )(١٤٧) طولهـــا : »
« الـــف میـــل ، وعرضهـــا »
« مبلـــغ خمســــــمأتێ »(١٤٨)

تێـــدا هەیـــە سێ‌صـــەدی بـــاب(١٤٩)
صـــەد هـەزار کـەس لـە کـــوللی بـاب
پیـــاوی جەنـــگی تەمـــام ئەســـباب
فەتحـــی بـــە چـــار تەکبـــیرەتێ

لەوێنـــدەرێ ڕەهـــا دەبـــن(١٥٠)
بـــە ( بیـت المقـدس )(١٥١) داخـڵ دەبـن

---

(١٤٢) بێ شومار ( ٢ ) دێتە ژیمار .
(١٤٣) دەکوژن ( ٢ ) دەگیرن .
(١٤٤) فەتتاح بە دوّ ( ٢ ) فەتتاحی ئەو ، فەتتاح بە یەك .
(١٤٥) ( فەتتاح .... تەکبیرەتێ ) لە چەند جێگەدا لەمەولا ( فەتحی ... تەکبیرەتێ ) بەکار ئەهێنێ ، ئەم جێگەش ڕەنگە وەك ئەوان بێت .
(١٤٦) لەوێندەرێ ... (٢) وەقتێ دەبن لەوێ ڕەها .
(١٤٧) قاطع (٢) قاطعة .
(١٤٨) ( قاطیع ) ناوی شارێکە درێژیەکەی هەزار میل و پانیەکەشی ( ٥٠٠ ) میل و (٣٦٠) دەرگای هەیــە و لەهەر دەرگایـەکی هـەزار شەڕکەر دەردەچێ ، بڕوانە لاپەڕە ١٠٤ ی ( الاشاعة ) .
(١٤٩) تێداهەیە...(٢) تێدا سێ‌صەدو شێصت باب .
(١٥٠) ئەم نێوە شیعرە لە (١)دا نەبوّ لە (٢) هێنامان .
(١٥١) بیت المقدس (٢) ( بیت القدوس ) .

بـــه دەججـــالێ ( مخبـــر ) دەبـــن
ئـــەو هاتـــە دەر بـــۆ فیتنـــەتێ(١٥٢)

لـــە وەقتـــی خەلـــقی ئـــادەمێ
نەبـووە فیتنـــە(١٥٣) بـــەو ئەعظـــەمێ
یـــا ڕەب هـــەر تـــۆی(١٥٤) موتتەقیـــمێ
حیفظـــن بـــکەی لـــەو فیتنـــەتێ

هـــەر لـــە نـــوحی بـــە پاشـــەوە
چـــی پێغەمبـــەرێ کـــە(١٥٥) بـــووە
ئوممـــــەتی ئـــاگاه کـــردووە
دا بـــزانن ئـــەو عەلامـــەتێ

گوتۆیـــە(١٥٦) ئیمـــامی نـــەوەوێ
بـــەوەن ســـەلەف و دیـــن قـــەوێ(١٥٧)
چـــاکە تەلقـــین دادەن(١٥٨) صـــەبێ
بەحشـــی(١٥٩) دەجـــالی لەعنـــەتێ

---

(١٥٢) وەکۆ وتمان لە هەر دەرگەیەك هەزار کەس هەیە نەك صەدهەزار و بە گوێرەی ڕیوایەتێك ئەو قەلایە بەسێ ( الله اکبر ) ئەگیرێ نەك بەچوار . بڕوانە لاپەڕە ١٠٤ی ( الاشاعة ) .

(١٥٣) نەبووە فیتنە (٢) فیتنە نیە .

(١٥٤) هەر تۆی (٢) تۆیی .

(١٥٥) پێغەمبەری کە بووە (٢) پەیغەمبەرە هاتووە .

(١٥٦) گوتۆیە (٢) گوتییە .

(١٥٧) بەوەن ... (٢) بۆ سەلەفێ دەدین قەوێ .

(١٥٨) دادەن ( ٢ ) دانی .

(١٥٩) بەحشی (٢) لە بەحشی .

ئــــەو فیتنەیـــــە بـــۆ عالـــــەمێ
عـــەزابی وتـــم(١٦٠) هـــەر یـەکدەمێ
چـێ صـــابیر بـێ(١٦١) بـــەو ئەلـــەمێ
خـــەلاص دەبـــێ لـــــە قیامـــــەتێ

لــــــە ئەصـــــــفەهانی وەدەردێ
هەفتاهـــــەزار جـــــوێت بـــۆ دێ
بـــۆ(١٦٢) نـــاو عێـــراق و شـــامێ دێ
بەڕاســـــت و چـــــەپ فەســـــادەتێ

دەعـــــوای ئـــــەووەڵ ئیصـــلاح دەکـا
هەمـــوو کەســـێ(١٦٣) گوێـــی لـــێ دەکـــا
لـــەو پـــاش کوفـــرێ ظاهـــیر(١٦٤) دەکا
موئمـــــین لێـــــی دەکـــەن فـــیرقەتێ

ســـــواری حیمـــــاری خۆش بـــــەزە
مابەیـــــن گوێیـــــانی چـل گـــــەزە
هەفـــتێ هـــــەزاری(١٦٥) (یلخزه)(١٦٦)
دەکـــەن لەژێـــــر گوێـــــی مەشیەتێ(١٦٧)

---

(١٦٠) وتیم (٢) وێ .
(١٦١) صابیر بێ بەو (٢) صابیر لە .
(١٦٢) بۆ (٢) بە .
(١٦٣) کەسێ ( ٢ ) کەسێک .
(١٦٤) ظاهیر ( ٢ ) ئیظهار .
(١٦٥) هەزاری ( ٢ ) هەزار جوێ .
(١٦٦) ( یلخزه ) = یەلخەزە : بە گوێرەی ڕێوایەتێك لە (الاشاعة)دا ئەبێ تەرجەمەی (الحاکة) بێ ، دوایش ئەڵێ : (الحاکة) ناوی شوێنێکە .
(١٦٧) دەکەن .... ( ٢ ) لە ژێری گوێی دەکەن مەشیەتێ .

کوفــــرێ دەبـــتێنن ئاشـــکار
لـــە نـــاوی چـــاوانیڕا دیـــار(١٦٨)
نەیخـــوندبێ یــــا خونـــدەوار
هەمـــوو دەزانـــن وی خەطـــێ

چاوێـــکی دەرپەڕێـــو دەبـــێ
ئـــەوی دێ لـــوس و پـــوس دەبـــێ
شـــیبهی ( عبد العـــزی ) دەبـــێ
مـــەردوودە لـــە(١٦٩) جەهالـــەتێ(١٧٠)

ئـــەو کافـــرەی یەکجـــار بـــەدە(١٧١)
دەڵـــێ بـــە خەڵـــقی : مـــن خـــودا
چـــێ موئمینـــە(١٧٢) دەبـــێ جـــودا
نـــاکا(١٧٣) لەبـــۆی ئیطـــاعەتێ

شـــاخی لـــە نێوچـــاوان دەبـــێ
پـــوڕ لـــە دووپشـــك و مـــار دەبـــێ
هـــەرچێ بـــەوێ بـــاوەڕ نـــەبێ
تێـــی بـــەردەدا بـــۆ لەدغـــەتێ(١٧٤)

---

(١٦٨) لە ناو چاوانی ... ( ٢ ) لە نێو چاوانیدا دیار .

(١٦٩) مەردوودە لە ( ٢ ) مەردوودە ئەو لە .

(١٧٠) ئەم چوارێنەو چوارێنی پێشوو لە نوسخەی ( ٢ )دا هەریەك لە جێگەی ئەوێ کەدایە .

(١٧١) ئەمە بۆ جارێ دووهەمێنە کە ( هـ ) لەگەڵ قافیەی ( ١ )دا ئەنوسێ .

(١٧٢) موئمینە ( ٢ ) موئمین بێ .

(١٧٣) ناکا ( ٢ ) ناکەن .

(١٧٤) ئەم چوارێنە لە نوسخەی یەکەمدا نیە .

ناکاتن ئەو ( تدبّر )ی(١٧٥) :
کە خودای بۆچی سواری کەری ؟!
خودا نابێ موحتاجی کەری
بە دوورە ئەو لە زیللەتێ(١٧٦)

ئەی دەججالی(١٧٧) هەوەکو کەر
ئەگەر تۆ هەی خودای بەشەر
تۆ زۆر مەڵێ ، یەکجار مەوەڕ(١٧٨) !
چاوی خۆت بێنە صیحەتێ(١٧٩)

ڕەببێ خالیقی سەما و ئەرض
عالم بە طوول و هەم بە عەرض
حاجەت نیە بڕوا لە ئەرض
بە دوورە ئەو لە زیللەتێ(١٨٠)

دەگەڵیەتی بەهەشت و نار
چێ بەهەشتێ بکا ئیختیار
لەبۆی دەبێ ساتێ بەنار
بەوی بێزانین عەکسیەتێ

سیه چیروان واقوی دەکا
شەرق و غەربان ئاگا دەکا

---

(١٧٥) ( تدبری ) ( ٢ ) (تفکری ) .
(١٧٦) بە دوورە .... ( ٢ ) عەجەب لەوێ غەباوەتی !
(١٧٧) دەججالی ( ٢ ) شەیطانی .
(١٧٨) ئەم نیوە شیعرە و نیوەی پێشوو لە ( ٢ )دا پاش و پێشن .
(١٧٩) ئەم چوارینە و چوارینی پێشوو لە ( ٢ )دا هەر یەکەی لە جێگەی ئەوی تردایە .
(١٨٠) زیللەتێ ( ٢ ) ڕەحمەتێ .

ئەرضی هەمو دیار دەکا
ئیلا مەگەر مەدینەتێ

( بیت القدوس ) مەسجیدێ طۆر
دەبێ لەواتیش ئەو بە دۆر
حافیظ دەبێ ڕەببی غەفۆر
ثابیت بە یەك ڕیوایەتێ

دەڕوا لە ئەرضی ئەو عەدۆ
میثلی بارانی با لەدۆ
ڕۆباری صاف دەچێ لەدۆ
عەجەب لەوێ بەلییەتێ(١٨١)

دەگەڵ وییە سەحەرە و(١٨٢) کوهھان
کێوان دەکا ساتێك بە نان
هەرچێ پێی نەبینێ ئیمان (١٨٣)
دەیهاوێتە نار(١٨٤) لەحظەتێ

زوڕنا و دەف و چەنگ و نەی
دایم دەبن لە پێش یەدەی
مەفتۆن دەبن سامیعی وەی
( الله ) مەگەر دا عیصمەتێ

---

(١٨١) ئەم چوار چوارێنە لە ( ١ )دا نیە .

(١٨٢) دەگەڵ وییە سەحەرە و ( ٢ ) دەگەڵیەتی سیحری .

(١٨٣) هەرچێ ... ( ٢ ) هەرچێ بەوێ نەبێ ئیمان .

(١٨٤) دەیهاوێتە نار ( ٢ ) داوێتە نار یەك .

ئەمریٚ دەکا لە (١٨٥) ئاسمان
دەڵێ بڕژێنە(١٨٦) بۆم باران
ساتێکی بۆی دەکا (١٨٧) ڕێژان
( اللە ) دەداتن موهلەتێ

قەومێ کە پێی باوەڕ بکا(١٨٨)
حەیوانی گوان پڕ شیر دەکا
ئەرضی هەمو گیای شین دەکا
دەکەونە حالی ویسعەتێ

ویسعەتی وان هەر یەك دەمێ
سەرخۆش دەبن ئەوێ دەمێ
لەو پاش دەکێشن زۆر غەمێ
لەبەر زەحمەت و شیدەتێ(١٨٩)

ئەمرێ دەکاتێ(١٩٠) کێو بچێ
دەر لەحظە کێو لەدوی دەچێ
لەناو بەحران ئاو دەردەچێ(١٩١)
دەگاتە جایێ ڕوکبەتێ

---

(١٨٥) لە ( ٢ ) تە .
(١٨٦) بڕژێنە ( ٢ ) بڕێژە .
(١٨٧) بۆی دەکا ( ٢ ) دەکا لەبۆی .
(١٨٨) قەومێ ... ( ٢ ) قەومێکی پێ باوەڕ دەکا .
(١٨٩) ئەم چوارینە تەنها لە نوسخەی ( ٢ )دا هەیە .
(١٩٠) ئەمرێ دەکاتێ ( ٢ ) ئەمر دەکاتە کێو .
(١٩١) لەناو بەحران .... ( ٢ ) هەرکە وەناو بەحرێ دەچێ .

کە ڕۆ لە(١٩٢) وێران دەکا
دەڵێ خەزێنەی(١٩٣) دەر بکا
دەر لەحظە بۆی ئیظهار دەکا
بە مثیلی پوورەی نەحلەتێ

فیتنەی عەظیم ئەمری دیگەر :
دەڵێ : ئەزم خودای لەسەر
داك و بابت بۆ بێنمە دەر ؟!
شەیطان دەیێ بە(١٩٤) صوورەتێ

ئەو خۆی لە شکڵی(١٩٥) وان دەکا
دەڵێ(١٩٦) : کوڕە باوەڕ بکا
« فان هذا ربك »(١٩٧)
عەظیمە ئەو لە فیتنەتێ

( خضر ) دەگەڵ وێ دەگەڕێ
دایم دەداتن خەبەرێ
قەط پێی مەکەن هیچ باوەڕێ
دوور بن لەوێ بەلییەتێ

---

(١٩٢) لە ( ٢ ) دە .
(١٩٣) خەزێنەی ( ٢ ) خەزێنان .
(١٩٤) دەیێ بە ( ٢ ) دەبێتە .
(١٩٥) خۆی لە شەکلی ( ٢ ) خۆ بە شەکلی .
(١٩٦) دەڵێ ( ٢ ) دەڵێن .
(١٩٧) واتە : ئەو شەیطانەی کە لە باتێ باوکی زەلامێك و لەسەر دێمەنی ئەو خۆی پێشانێ کوڕە دەدا « دەڵێ : کوڕە باوەڕ بکە ئەمە ـ واتە دەجال ـ خوای تۆیە ! » .
لەم دوو نێوە شیعرەشدا جارێکیتر قافیەی ( ه ) و ( ا ) یەك خران .

هەر بانگ دەکات(١٩٨) : ئەی قەومی خوێن
دەججالە مەردوودی(١٩٩) لەعین
کوفری لەناوچاوان(٢٠٠) ببین
بەدوورە ئەو لە ڕەحمەتێ

کە ئەو لەعین ڕووی تێ دەکا
دوروست بە دوو کەرتێ دەکا
لەوپاش خودا زیندووی دەکا
نابێ لەسەر وێ قودرەتێ(٢٠١)

ئەییامی وی چل ڕۆژ(٢٠٢) دەبێ
ڕۆژی ئەووەڵ وەك ساڵ دەبێ
ڕۆژی دوەم وەك ماه دەبێ
ڕۆژی سێمین(٢٠٣) وەك جومعەتێ

ڕۆژی دەدێ ڕۆژی دەمەن
ڕۆژ و شەوان مەقدوور دەکەن
ماه و جومعان مەحسووب دەکەن
بۆ نوێژ و ڕۆژوو و طاعەتێ(٢٠٤)

---

(١٩٨) دەکات ( ٢ ) دەکا .

(١٩٩) مەردوودی ( ٢ ) ئەو مەردی .

(٢٠٠) ناو ( ٢ ) نێو .

(٢٠١) ئەم چوارینە تەنها لە ( ٢ )دا هەیە .

(٢٠٢) چل ( ٢ ) چیهل .

(٢٠٣) سێمین ( ٢ ) سییەم .

(٢٠٤) ئەم چوارینە ش تەنها لە ( ٢ )دا هەیە .

لـه پێش ئـەو دەججـالی کـەززاب(٢٠٥)
لـــە پێش ئـــەو دەججـــالی کـــەززاب
سـێ ســـاڵ دەبـــێ قەحـــطێ و عـــەزاب
حەیـــوان دەبـــن هەمـــێ بـــێ تـــاب

ڕێ دەکاتـــە ( بیـــت القدســـێ )(٢٠٦)
مەهـــدێ حەصـــار دەکـــا حەبســـێ
حەتـــا دەخـــۆن ژێـــێ قەوســـێ
لـــە قەحـــطێ و برســـییەتێ

تەقـــدیری ڕەبیـــێ « ذو الجـــلال »(٢٠٧)
بەدەســـت عیســـا نـــازل لەعـــال
مەقتـــوڵ دەبـــێ شـــیقی بەطـــال
دەێتـــە خـــوار(٢٠٨) بـــۆ نەصـــرەتێ

نـــازڵ دەبـــێ بـــە ئەمـــری ڕەحمـــان
دەســـتی لەســـەر دوو مەلـــەکان
هـــەروەك دوڕ(٢٠٩) وا عـــەرەق لـــە ڕووان
لەکـــن بەیضـــا و(٢١٠) منـــارەتێ

---

(٢٠٥) ئەم چوارێنەی خوارەوەش لە ( ٢ )دا بەم شێوەیە :
**« دەبێ لەپێش وێ دەججالی کەززاب**
**سە ســـاڵ دەبێ قەحـــطێ و عـــەزاب**
**حەیـــوان هەمـــێ دەبـــین تەبـــاب**
**لەبـــەر زەحمـــەت و دەهشـــەتێ »**

(٢٠٦) ڕێ دەکاتە ... ( ٢ ) دەچنە ( بیت المقدسی ) .

(٢٠٧) « ذو الجلال » ( ٢ ) « ذی الجلال » .

(٢٠٨) دێتە خوار ( ٢ ) تێتە خوار .

(٢٠٩) هەر وەك دوڕ وا عەرەق ( ٢ ) هەر وەکو دوڕ عەرەق .

(٢١٠) بەیضا و ( ٢ ) بەیضای .

منارەی سپی لە دیمەشقی
قەریبە(٢١١) لە ( باب الشرقی )
مەخلوقی دێ لەوێ(٢١٢) شەوقی
پێشان دەدا(٢١٣) بەشارەتێ

دەچێ ڕۆ دەکاتە قودسێ
لە دەجال بیرێ نەفەسێ(٢١٤)
مەهدێ قوتار کا(٢١٥) لە حەبسێ
دەری بێنێ(٢١٦) لەو ضەیقەتێ

کە دەگاتە ( وارش )ی(٢١٧) قودسا(٢١٨)
دەرگە(٢١٩) بەندە لەبەر ترسا
دەلێ : وەیکەنێ(٢٢٠) ئەزم عیسا
هاتوم بۆ فەتح و نەصرەتێ

واریـد دەبێ لە سەحەرێ
دەکات(٢٢١) صەفی نوێژی فەجرێ

---

(٢١١) قەریبە ( ٢ ) نیزیکە .
(٢١٢) دێ لەوێ ( ٢ ) دیلێ پڕ .
(٢١٣) پێشان ( ٢ ) پێیان .
(٢١٤) لە دەجال ... ( ٢ ) لە دەجالی ئەو دەیورسێ .
(٢١٥) قوتارکا ( ٢ ) خەلاص‌کا .
(٢١٦) دەرێ بێنێ ( ٢ )دا بێتە دەر .
(٢١٧) لە ( الاشاعة )دا لە باتی ( وارش ) شاری ( لود ) ئەلێ ، بڕوانە لاپەرە (١٣٦) . وە ( وارش ) وشەیەکی تورکیە ، بە مانای شوراو دەور و بەری شورا بەکار ئەهێنرێ .
(٢١٨) قودسا ( ٢ ) قودسێ .
(٢١٩) دەرگە ... ( ٢ ) دەربەیان بەندە لەبەر تورسێ .
(٢٢٠) وەیکەنێ ئەزم عیسا ( ٢ ) وەیکەن ئەزم عیسێ .
(٢٢١) دەکات ( ٢ ) دێتە .

عیسا ملی مەهدێ دەگرێ
دەبێ بکەی(٢٢٢) ئیمامەتێ

کە ئیمامی داوە سەلام
نوێژی صوبحێ کردیان تەمام
دەکەن شوکری ڕەببی عەلام
لە سەر نور(٢٢٣) و بەشارەتێ

دەرکەی(٢٢٤) ( وارش ) دەکاتەوە
دەججال هەڵدێ لە پاشەوە(٢٢٥)
هەر وەکو(٢٢٦) خوێ دەتوێتەوە
لە ترسی ضەربی حەربەتێ

دەڵێت(٢٢٧) بەوێ خەبیثی شوم :
کێوا دەچی قاتیلی توم ؟
ضەرب دەدا لەئەستۆ و حەلقوم(٢٢٨)
دەیکوژێ بە یەك مەڕەتێ

لەو پاش دەچێتە زگێ عەسکەرێ
لێیان دەبنە گورگی مەڕێ
خەلاص ناکەن یەك نەفەرێ
لە ئەتباعی وێ لەعنەتێ

---

(٢٢٢) دەبێ بکەی ( ٢ ) تەمام بێکە .
(٢٢٣) نور و ( ٢ ) نوری .
(٢٢٤) دەرکەی ( ٢ ) دەربی .
(٢٢٥) لە پاشەوە ( ٢ ) بە پاشەوە .
(٢٢٦) هەر وەکو خوێ ( ٢ ) وەکی خوێێ .
(٢٢٧) دەڵێت ( ٢ ) دەڵێ .
(٢٢٨) ضەرب ... ( ٢ ) زەرگێك دەداتین لە حەلقوم .

دار و بەردیش دەکـا(٢٢٩) نیـدا
ئەڵێ(٢٣٠) : ئـەوا لـە ژێـر منـدا
یەهـوودی ، دەجـال بـەدا(٢٣١)
دەیانکوژن(٢٣٢) بـەو قەتلەتـێ

ئـەرض لـە ڕیجسـێ پـا دەکـەن
هەمـوو صەلتیبـان دەق دەکـەن
زەبحـی خەنـازیران دەکـەن
دەکەونـە خۆشـێ و ڕاحەتـێ

وەحـی لـە بۆعیسـا دەیـێ
یەئجـووج و مەئجـووج دەردەێ
بـۆ هیلاکـی عـالەم دەێ
خـۆ بـاوێنە نـاو قەلعەتـێ

دەچنـە طـورێ دەکـەن حەصـار
قەحطـی دەبـن(٢٣٣) لـەوان یەکجـار
سـەری ثـەورێ بـە صـەد دینـار
دەکەونـە حـاڵی ضەیقەتـێ

ئـەو دوو قەومیـن بـێحەدد و زۆر
زۆر موفسـید و ئەهلـی شـوروور

---

(٢٢٩) دەکا ( ٢ ) دەکەن .
(٢٣٠) ئەڵێ ... ( ٢ ) دەڵێن : ئەوە دەژێر .
(٢٣١) ئەمەش ئیشارەی دوو ڕیوایەتە ، واتە : ڕیـوایەتێکیان « ئەڵێ : ئەوا لەژێر مندا یەهوودی . » ئەویتر : « وا لەژێر مندا دەجال . »
(٢٣٢) دەیانکوژن ( ٢ ) دەیکێشنە دەر .
(٢٣٣) دەبن ( ٢ ) دەبێ .

( كـــل يلـــد الـــف الذكـــور )
مەخلوقـــی دەخەنـــە ضەیقەتـــێ (٢٣٤)

نایـــەڵن لـــە ئـــەرض دەییـــار(٢٣٥)
نەفیـــل و وەحش ، نـــە ئەطیـــار(٢٣٦)
دەخۆنـــەوە هەمـــو ئابـــار
ســـوبحانە خێـــوی قودرەتـــێ !

گوێیەکیـــان هـــەر وەکـــو پەســـتەکێ
هەندێـــك ڕایەخـــەن لێوەکـــێ
لێـــوی ژۆر و وەك لێفـــــەکێ
دەکـــەن لەنـــاو وێ نەومەتـــێ(٢٣٧)

یـــەك بـــە بیستـــی قەومێـــك لـــەوان
بەعضـــی دیگـــەر وەصفـــی دەدان
لێـــوی گـــوێ خۆراکـــی(٢٣٨) وان
موختەلیفـــن لـــە خیلقەتـــێ

لـــە بەعضێ تەصنیفـــان موشـــاع
قەومێـــك لـــەوان صـــەد و بیســـت زیراع
لە ئاسمانـــان(٢٣٩) دەکـــەن نیـــزاع
تـــیران داوێـــن بـــە(٢٤٠) ڕیفعـــەتێ

---

(٢٣٤) ئەم چوارینە لە ( ٢ ) وەرگیراوە .
(٢٣٥) نایەڵن ... ( ٢ ) لە ئەرضی نایێڵین دەییار .
(٢٣٦) وەحش نە ئەطیار ( ٢ ) وەحشێ و ئەطیار .
(٢٣٧) ئەم چوارینەیش زیادەی ( ٢ )وە .
(٢٣٨) خۆراکی ( ٢ ) ڕایەخی .
(٢٣٩) لە ئاسمانان ( ٢ ) لە ئاسمانیتش .
(٢٤٠) بە ( ٢ ) بو .

تیـر دێنـه خــوار خـۆنی(٢٤١) لەسـەر
مەغـرۆر دەبـن ، خاکیان(٢٤٢) بەسـەر !
نــايەڵن ئەوراقــی شەجــەر
هەم نـه بەحری(٢٤٣) طەبەرییەتــێ (٢٤٤)

یــا ڕەب ئــەوان پـاکەوە کـات(٢٤٥)
عیسـا موناجـاتێ دەکـات :
هــەر یەك کرمێك لـە ئەستۆی دەکـات(٢٤٦)
هەمــۆ دەچنــە هیلاکەتــێ

موددەی هەفت ســاڵ لـە پاشـی وان
ئــاگیر دەکــەن ئەهلــی ئیمــان
لــە تیــر و کــەوان مەتــاڵی وان
لــە بــەر زۆر و غەڵەبــەتێ(٢٤٧)

ئــەرض لــەوانیش پــاك دەبــێ
قــەوم لــە بەنـدێ ڕەهــا دەبــێ
لــە ئەرضــی بەرەکـەت زۆر دەبــێ
لــە شــتینا و(٢٤٨) ثەمەرەتــێ

---

(٢٤١) خۆنی ( ٢ ) خۆنیان .
(٢٤٢) خاکیان ( ٢ ) خاکی .
(٢٤٣) هەم نە بەحری ( ٢ ) نە هەم بەحری .
(٢٤٤) ئەم نێوە شیعرە بەبێ وشەی ئاو مانای تەواو نابێ واتە : « هەم لـە بەحری طەبەرییە ئاو نایەڵن هەمـوی ئەخۆنەوە ، وەك گـەڵای دار نایەڵن هەموی ئەخۆن . »
(٢٤٥) پاکەوە کات ( ٢ ) فانێ بکا .
(٢٤٦) لە ئەستۆی دەکات ( ٢ ) دەستۆی دەکا .
(٢٤٧) ئەم چوارینە لە ( ٢ ) وەرگیراوە .
(٢٤٨) شتینا و ( ٢ ) شتیناێ و .

موددەی عیتسا دەبێ هەفت(٢٤٩) ساڵ
نیکاح دەکا دەبێ منداڵ
لەو پاش مەوتی نازڵ بەحاڵ
مەدفون دەبێ لە حوجرەتێ(٢٥٠)

لە پاش مەوتی عیتسای شەریف
دابە خورۆج(٢٥١) لەبۆ تەخویف
لە صەفا(٢٥٢) یا لە مەروەی ظەریف
« او من وادی تهامتێ » (٢٥٣)

یا لە(٢٥٤) شیعبی ( جیاد )ێ
سێ صەیحەتان دەکا نادێ(٢٥٥)
دەبییەن حاضر(٢٥٦) و بادێ
ئەرض دەبێتە زەلزەلەتێ

دەشوبهێ بە زۆر حەیوانێ
کەلام لە ڕەنگی ئینسانێ
پێیە موهری سولەیمانێ
پێی ڕەش دەکاتن جەبهەتێ

---

(٢٤٩) هەفت ( ٢ ) چل .

(٢٥٠) له حوجرەتێ ( ٢ ) به حوجرەتێ .

(٢٥١) خورۆج ( ٢ ) دەردێ .

(٢٥٢) له صەفا یا له ( ٢ ) له صەفاو و .

(٢٥٣) واته : دابه یا لەو جێگایانه یا له شێوی ( تهامه) دەردێ .

(٢٥٤) یا له ( ٢ ) یان دێ له .

(٢٥٥) نادی ( ٢ ) بادی .

(٢٥٦) دەبییەن .... ( ٢ ) دەبیێ حاضر و .

هەم پێیەتی عەصای ثوعبان(٢٥٧)
کە دەیدا(٢٥٨) لە ڕۆی ئەهلی ئیمان
دایسێ وەك نەجمی ئاسمان
لە غایەتی شەفافەتێ

قەضای ڕەببی وەها دەبێ
کەس لە چنگی خەلاص نابێ
کوفر و ئیمان جودا دەبێ
دەناسن ئەو بە عەلامەتێ

وێ(٢٥٩) ڕۆژی دابە دەردەیێ
ڕۆژ لە مەغریبی هەڵدەیێ
مانگیش لە جەنبی وێ دەیێ
بەرانبەرن لە طەلعەتێ

« کذا قال عصقلانی »(٢٦٠)
حافیظ و حیبری زەمانی
دابە لە ئەرض و(٢٦١) ئەو لە ئاسمانی
وێکرا دەبنە عەلامەتێ

هەمو ڕۆژێ سەجدە لەسەر
لە ژێر عەرشیدا بچێتە دەر

(٢٥٧) عەصای ثوعبان : مەبەست عەصاکەی حەزرەتی موسایە کە بو بە مار و مارەکانی ساحیرەکانی هەمو قوزتەوە .
(٢٥٨) کە دەیدا ( ٢ ) دەدا .
(٢٥٩) وێ ( ٢ ) ئەوێ .
(٢٦٠) ( کذا قال ... ) ( ٢ ) وەهای گوتووە عەسقەلانی .
(٢٦١) ئەو ( ٢ ) ڕۆژ .

ئیـــذن نـــابێ وێ شـــەو بـــەدەر
ســـێ شـــەو بـــەوێ کەیفییـــەتێ(٢٦٢)

صـــاحیب ( تهجـــــــد ) و ( اوراد )
هەڵدەســـتن وەك شـــەوان موعتـــاد
هەمـــو نوێـــژان(٢٦٣) دەبـــن ڕەقـــاد
ســـێ جـــار دەکـــەن وێ هەیئـــەتێ

هـــەر کـــە دەکـــەن نوێـــژی فەجـــرێ
دڵ پـــڕ لـــە خۆفـــن(٢٦٤) دەکـــەن فـــکرێ
ڕۆژ هەڵـــدەبێ دەگـــەڵ بـــەدرێ
لـــە مەغـــریبی بـــە دەهشـــەتێ

دەیـــەن تـــا نێـــوەی(٢٦٥) ئاســـمان
دانـــاس بـــزانن(٢٦٦) ئـــەو نێشـــان
لـــەو پـــاش ڕاجیـــع ئەجێیـــی(٢٦٧) جـــاران
بەنـــدەبێ دەرکـــەی تەوبـــەتێ

---

(٢٦٢) بەگوێرەی حەدیثێك : سێ ڕۆژ پێش ئەوەی ڕۆژ بگەڕێتەوە ، مانگ و ڕۆژ حەبس ئەکرێن و ، ئیذن نادرێن کە هەڵبێن ، دوای ســێ ڕۆژە ڕۆژ لە ڕۆژ ئاواوە لە گەڵ مانگدا پێکەوە هەڵدێن و ئەگەنە ناوەڕاستی ئاسمان و دوایێ ئەگەڕێنەوە و دەرکی تەوبە دا ئەخرێ بڕوانە (١٦٦) (الاشاعة) .

(٢٦٣) هەمو نوێژان ( ٢ ) نوێژان دەکەن .

(٢٦٤) پڕ لە خۆفن ( ٢ ) بە خۆفن .

(٢٦٥) دەیەن تا نێوەی ( ٢ ) دەیێن هەرتا نێوی .

(٢٦٦) دا ناس بزانن ( ٢ ) هەمو دەزانن .

(٢٦٧) ئەجێیی ( ٢ ) بەجێیی .

هەڵدەگیرێن(٢٦٨) صوحف و ئەقلام
بەطال دەبن کاتبی کیرام
ئوممەت بەخۆ(٢٦٩) شاهید تەمام
چ حاجەتە بە کیتابەتێ ؟

گوتویە کوڕی عەمری بن عاص(٢٧٠)
ـ مەعدوودە لە ئەصحابەی خەواص ـ :
چە کافر بێ نابێ خەلاص
هەم گونەهکاری ئوممەتێ

« عن ابن عباسی جلیل »
مەقبوولە ئیسلامی « طفیل »
هەم تەوبەیێ عاصی ڕەزیل(٢٧١)
لە پاش ئیتیانی ئایەتێ(٢٧٢)

ظاهیر لە قورئانی ئەجەلل
هەم لە قەولی نەبیێ ئەکمەل
ئەصەح لەوان قەولی ئەوەل
گوتویە(٢٧٣) عولەمای ئوممەتێ(٢٧٤)

---

(٢٦٨) هەڵدەگیرێن ( ٢ ) هەڵدەگیران .

(٢٦٩) ئوممەت بەخۆ ( ٢ ) رومەت بۆ خۆی .

(٢٧٠) گوتویە ... ( ٢ ) گوتی کوڕی عەمری بنو عەبباس ، ئەم قسەی نوسخەی دوو ڕەنگە هەڵەی نووسەر بێ ، قسەی یەکەم ڕاستە .

(٢٧١) ڕەزیل ( ٢ ) زەلیل .

(٢٧٢) پاش هاتنی ئایەت ، مەبەست هاتنی دابەیە .

(٢٧٣) گوتویە ( ٢ ) گوتیه .

(٢٧٤) واتە : ئەوەی لە قورئان و حەدیث وەرئەگیرێ ، لە دوو قسەکەی « عبد اللەی » کوڕی عەمر و « عبد اللەی » کوڕی « عباس » قسەی یەکەم ڕاستە و پاش گەڕانەوەی خۆر تەوبە لەکەس قوبوڵ ناکرێ .

لـــەو پـــاش دوخـــان پەیـــدا دەبـــێ
مەشـــریق و مەغـــریب پـــڕ دەبـــێ
هەرتـــا چـــل ڕۆژ بـــاقی(٢٧٥) دەبـــێ
ئـــەویش(٢٧٦) ئەشـــراطی ســـاعەتێ

بـــۆ موئمینـــان شـــیبهی زوکـــام
بـــۆ کافـــیران زەحمـــەت تەمـــام
دەردێ دوخـــان دایـــم مـــودام
لە ئـــەنف و گـــوێ و عەیـــن و ئوســـتێ(٢٧٧)

لـــەو پـــاش(٢٧٨) دەنگوێ بایـــەك لـــە شـــام
دەکـــا قەبضـــی ڕۆحـــان(٢٧٩) بەعـــام
بـــۆ موئمینـــی(٢٨٠) ئیمـــان تەمـــام
ئـــەوەی ئاخـــیر عەلامـــەتێ

هەڵدەگـــیرێ(٢٨١) قورئـــان غەفـــوور
مەرفـــوع دەبـــێ هـــەم لـــە صـــودوور
خـــەراب دەبـــێ کەعبـــەی پـــڕ نـــوور(٢٨٢)
بـــە دەســـتی ( ذی ســـویقتێ )(٢٨٣)

---

(٢٧٥) باقی ( ٢ ) تەمام .
(٢٧٦) ئەویش ( ٢ ) ویش .
(٢٧٧) لە ئەنف و ... ( ٢ ) لە ئەنف و عەین و گوێ و ئوستێ .
(٢٧٨) لەو پاش ( ٢ ) لە پاش .
(٢٧٩) دەکا قەبضی ڕۆحان ( ٢ ) قەبضی ڕۆحان دەکا .
(٢٨٠) بو موئمینی ( ٢ ) لە موئمینان .
(٢٨١) هەڵدەگیرێ ( ٢ ) نامێنێ .
(٢٨٢) پڕ نوور ( ٢ ) لە نوور .
(٢٨٣) (ذی‌سویقتی) : خاوەنی دوو قوای بارێك . واتـە : کەعبە بەدەستی کابرایەکی قولبارێکی حەبەشی وێران دەبێ . بڕوانە : (١٦١)ی ( الاشاعة ) .

هـــەر دەمـــێنن ( اشــرار النـــاس )
چـــێش(٢٨٤) نازانـــن دەکـــەڕ و کـاس
پـــێریان دەبێتنـــە(٢٨٥) ( الخنـــاس )
لێـــی وەردەگـــرن طەریقـــەتێ

خـــۆ دەکـا بـــە شـــەیخی(٢٨٦) زەمـان
دەیانـــکاتە عەبـــدی(٢٨٧) ئەوثـــان
نەخـــەیر دەزانـــن نـــە ئیحســـان
هـــاوار لەبـــەر وێ غەفلـــەتێ(٢٨٨)

ئیســـرافیل بـــە ئەمـــری جەبـــار
نەفخـــی ( صـــور )ش(٢٨٩) ئـەکا ئیظهـار
چـــی دەبینیـــەن(٢٩٠) دەنـــگی کوبـــار
هەمـــوو دەمـــرن بـــە صەیحـــەتێ

چـل ســاڵ دەبێ چـۆڵ و وێـــران(٢٩١)
( اللـــه ) دەبـــارێنێ بـــاران
هـــەر بـــە(٢٩٢) شیبهی مـەنی ئینســـان
ئەجســـاد دەڕوێـــن بـــە قودرەتـــێ

---

(٢٨٤) چیش نازانن ( ٢ ) چیە نەزانێین .
(٢٨٥) پێریان دەبێتنە ( ٢ ) دەێیتە نێویان .
(٢٨٦) بە شەیخی ( ٢ ) تە شێخی .
(٢٨٧) دەیانکاتە عەبدی ( ٢ ) دەیانکا عابیدی .
(٢٨٨) غەفلەتێ ( ٢ ) فیتنەتێ .
(٢٨٩) صورش ( ٢ ) صوورێ .
(٢٩٠) چێ دەبینیەن ( ٢ ) هەر کەس دەبێ .
(٢٩١) چل ساڵ ... ( ٢ ) لەو پاش چیل ساڵ چۆڵ و وێران .

نەفخـــــی دووەم گـــــەرا دەبـــــیٚ
هەمـــو ئینسـان(٢٩٣) قایـــم دەبـــیٚ
لەسـەر قەبـــریٚ هایـــم دەبـــیٚ(٢٩٤)
لەبـــەر حـــیٚرەت و دەهشـــــەتیٚ

دەیانئـــاژوٚن بـــوٚ مەحشـــەریٚ(٢٩٥)
بـــوٚ جـــەزایێ خـــیٚر و شـــەڕیٚ
هـــەرکەس غـــەمێ دیٚتـــە بـــەریٚ
دەکیٚشـــیٚ(٢٩٦) ئـــاه و حەســـرەتیٚ

بەحـــشی عیتســـای عـــالی ڕوتبـــەت
تەقدیٚـــر وەبـــو کەوتـــە ( فتـــرت )
بـــە(٢٩٧) هەشـــتادی (قـــد تـــمت )
دەگـــەڵ بـــاقێ عەلامـــــەتیٚ(٢٩٨)

خەتمـــــی عەلامـــــەتان تەمـــــام
ئەوجـــا(٢٩٩) کوٚتـــا بـــکەین کـــەلام
ئەرجـــو لـــە ( رب ذی الانعـــام )
خەلاصـــــن کـــا لـــە قیـــامەتیٚ

---

(٢٩٢) بە ( ٢ ) لە .
(٢٩٣) هەمێ ئینسـان ( ٢ ) ئینسان هەمێ .
(٢٩٤) هایم : سەرلیٚشیٚواو و ڕیٚ بە کارنەبەر ، واتە : لەبـەر ناخوٚشی ئەو ڕوٚژە کە خەڵك زیندێ دەکریٚنەوە و لە گوٚڕ دیٚنـە دەریٚ هەمێ سـەر لیٚشیٚواون و کەس نازانیٚ چێ بکا .
(٢٩٥) دەیان ئاژوٚن : لیٚیان ئەخوڕن .
(٢٩٦) دەکیٚشیٚ ( ٢ ) دەکیٚشن .
(٢٩٧) بە ( ٢ ) ویٚش لە .
(٢٩٨) ئەم چوارتینە لە ( ٢ )دا لە دوای چوارتینی « نەظم کرا ... »وەیە .
(٢٩٩) ئەوجا ( ٢ ) ئینجار .

نەظـــــــم کرا بـــــــــە ناخـــــــۆشێ
دڵ پــڕ لـــــە غـــــەم و بێهـــــۆشێ
لـــە تەئـــریخی هەفتـــــا و شـــــەشێ
« بعـــــد الـــــف و مـــــأتێ »(٣٠٠)

نەظمم کـــرد بـــە قـــەولی(٣٠١) صـــەحیح
بـــە لەفظی کـــوردێ نــا فەصـــیح(٣٠٢)
بـــۆ مونصـــیفان ( لا للشحیـــــح )(٣٠٣)
بـــــۆ ئینتیفـــــــاعی عامـــــــەتێ

---

(٣٠٠) ( بعد الف ومائتێ ) : لە پاش هەزار و صەد ، واتە : مێژووی دانـــانی کتێبەکە ساڵی ( ١١٧٦ )ی کۆچیە .

(٣٠١) بە قەولی ( ٢ ) لە قەولی .

(٣٠٢) ( کوردێ نافەصیح ) : ئەوەی لێ وەرناگیرێ کـە بڵێین : مەبەســتی ئەوەیە کوردێ زمانێکی ناجۆر و ناڕێك و بێ بناغەیە و ، هەر زمانـــی عەرەبێ و فارســێ شیاوی هەمێ بـاس و ڕازێکی زانیـارێن و هەمێ مەرجێکی ڕەوانێ و ڕەوانبێژێ هەر لەواندایە و لە زمانی کوردێدا نیە، بەڵکو ئەڵێین : مەبەستی ئەوەیە وەك ئەڵێن : ( هضم النفس ) بکاو لە عاستی کارەکەیدا خۆی بە ناتەواو پێشـــان بدا ؛ چونکە کوردیەکەی پوخت نیە و فارسێ و عەرەبێ تێکلاوە ، واتــە ( کوردیەکی فەصێحی دوور لەزمانی بێگانە نیە ) ؛ چونکە ئەگەر کوردێ بەلاوە بـاش نەبوایە و بە زمانێکی ڕەوانی نەزانیایە ئەو کارە گەورەی پێ نەئەکرد و ئەو کتێبەی بەو شێوە جوانـــە پێنەئەهۆنیەوە . خـــۆ ئەگەر بێویستایە بە زمانی عەرەبێ یا فارســێ بێهۆنیایەتەوە هەرگیـــز گیرو گرفت و کۆسپ و تەگەرە ڕێگەی زمانی نەئەهات و خـــۆی شاسواری مەیدانـــی هەردوو زمانەکە بووە و ، پیاوانی وەکو مامۆســـتا مەلا ( عبدالله )ی بێتۆشێ و مامۆستا شێخ مارفی نۆدێ شانازییان بـــەوەوە کردووە کە لە خزمەت ئەودا فێری ئەدەب و زمان بوون .

=

ئــــــەزم محەممـــــەدی دڵـــــڕێش
حاڵــــم وەکـــێ حـــاڵی دەروێــــش
پــــەردەی غەمـــــان دایــــم لــــەپێش
لـــــەبەر خــــــۆفی عاقیبــــەتێ

وەقتـــێ دەچێنـــه ژێـــر گڵـــێ(٣٠٤)
غەمــــــم زۆرن لەســـــــەر دڵـــــێ
وەك مەنجـــەڵی پـــــڕ دەکــــوڵێ
لــه خــوای دەخــوازێن(٣٠٥) راحــەتێ(٣٠٦)

١٥٦ ★ ★ ★

---

=

(٣٠٣) بۆ مونصیفان لا للشحیح : واته ئەم کتێبەم بـۆ کەسانێکی به ویژدان داناوه که ڕێزی شت له جێگەی خۆیدا بگرن ، نەك بۆ کەســانێك که به هیچ ناڵــێن باش و تەنهــا بەخالــەت به خەڵكبــردن نەبــێ هیچ مەبەستێکیان نیه . ئەم کتێبەم بـۆ کەڵکی عەوام و پلەنــزمان داناوه نەك بۆ زانا و پیاوی خوێندەواری بەرز .

(٣٠٤) ئەم نیوه لەگەڵ نیوەی « غەممدا ... » له ( ٢ ) دا هەر یەك له شوێنی ئەوی‌تردایه .

(٣٠٥) دەخوازێن ( ٢ ) دەخوازێ .

(٣٠٦) له کۆتایی نوسخەی ( ٢ ) دا ئەمه نوسراوه :

« تمت المنظومة المسماة بالمهدی نامه الکردی ، من کـلام ابن الحــاج ــ رحمه الله ــ في ســنة ١٢٨٨ » . وه له لایەکی کەشــەوه ــ هەر له کۆتاییدا ــ نوسراوه :

« بحمد الله که شـــد نامم محمد ، تمام شـــد در شـــب یکشنبه در ( ساوجبلاغ ) » .

تمت شد کلام (ابن الحاج) از بحث مهدی و سفیان ، از بیست هشتمی ماه رمضان ، في حجرة ( بێژوه ) در خدمت استاذی ملا محمد و ملا احمد غفرالله لی ولهم امین • آه !(۳۰۷) •

★ ★ ★

---

(۳۰۷) ( ئەم کتێبە )کە فەرمودەی ( ابن الحاج )و باسی مەهدیّ و سوفیان ئەکات ، لە ۲۸ مانگی ڕەمەزاندا لە حوجرەی بێژووە ( گوندێکە لە نزیکی سەردەشت ) لە خزمەت ماموستایان مەلا محەممەد و مەلا ئەحمەددا نوسرایەوە . خودا لە منیش و لەوانیش خوش بێ (ئامین) .